# کاروان

30
ئازاری 1985 سالّی سێیەم

گۆڤارێکی رۆشنبیریی مانگانەیە ئەمیندارێتیی گشتیی رۆشنبیریو لاوان بە زمانی کوردیو عەرەبی دەری دەکا ..





◀ تابلۆی بەرگی یەکەم
محمد عارف

تابلۆی بەرگی دووەم ◀
لیۆناردۆ داڤینشی




سەرپەرشتکاری بەرگ
**محمد عارف**

---

دەرهێنانی هونەری
**محمد زادە**

---

سەرپەرشتکاری چاپ
**جعفر قادر بەرزنجی**

**لە کتێبخانەی گشتی لە بەغدا**
**ژمارە (٤٨٣) ی ساڵی (١٩٨٢) ی دراوەتێ**
**لە چاپخانەی (دار آفاق عربية) چاپ کراوە**
**نرخی (٢٠٠) فلسە**

ئەدرس :
هەولێر : بەڕێوەبەرایەتی گشتیی
رۆشنبیری و لاوان
گۆڤاری (کاروان) ت : ٢٠٨٨٢


## تکا لە نووسەران

- لەگەڵ بەرهەمەکەتدا ناوی سێقۆڵی و ئەدرەسی تەواوت بنووسە .
- خەتەکەی شاش و خۆش بێ و قەڵەمی پاندانی تێدا بەکار بێنە .
- بەرهەکەت پەسند بکرێ و نەکرێ بە نووسین وەرامت دەدرێتەوە .
- ئەگەر بەرهەمەکەت پەسند نەکرا ، هەقی داواکردنەوەیت نی‌یە .
- چەندە پێت دەکرێ وێنەو نەخشەی پێویستمان لەگەڵدا بۆ بنێرە .

---

# کاروان


گوڤارێکی ڕۆشنبیریی مانگانەیە
ئەمیندارێتی ی گشتی ی ڕۆشنبیری و لاوان بە زمانی
کوردی و عەرەبی دەری دەکا

سەرنووسەر

محمد أمين محمد أحمد

30

ئازاری / 1985 سالی سێیەم


لەم ژمارەیەدا

سەرنووسەر

# شان بەشانی سەرکەوتنمان لە قادس
# کوڕوکاڵانی گەلمان ئاهەنـ

## «قادسیەی صدام»

.. قادسیەی صدام ، کە هەفتەییێك‌و پتر لە هەفتەییێك دەخایەنێ‌و لە ڕۆژی نەورۆزەوە تا کۆتایی مانگ ئاهەنگ‌و زەماوەند بە بۆنەی ، لە لای گەلەمان ، دەگێڕدرێ .. «قادسیەی صدام» وەك جەنگێکی بەرگری لە سەربەخۆی نیشتمان‌و دەسکەوتەکانی شۆڕشی 17 — 30 ی تەمموز ، شتێکی پێویست بوو لە ئەنجامی دەستدرێژیەکەی کاربەدەستە گومان لێکراوەکانی قوم‌و تاران بۆ سەر گوندو شارەکانی ڕۆخ سنووری رۆژهەلاتی نیشتمانەکەمان ، هاتە کایەوەو لە چوار ئەیلولی ساڵی 1980 سوپای نەبەزمان هەڵمەتێکی دلێرانەی بۆ سەر هێزی دەست درێژکەر بردو بۆ ماوەییێکی زۆر کەم توانی سوپای دوژمنی بەکرێگیراو بشکێنێ‌و هێزە ترسنۆکەکانی تەفرو تونا بکات .. تێکڕای جەنگەکانی سوپاکەمان لە رۆژی 4ی ئەیلوولی 1980 تا ئەمڕۆ بە «قادسیەی صدام» ناویان بردراو لەو رۆژەوە مێژوو «قادسیەی صدام»ی بە تیپی زێڕین تۆمار کردوو تۆماری دەکات .

ئەوەی وا لە «قادسیەی صدام» بگا ، کە گوایە ، تەنها زەبر وەشاندنی کۆشندەیە دژی دوژمن‌و هێزەکانی ، لە لایەن سوپا قارەمانەکەمان ، بە ڕاستی تەنیا لە لایێکی یا خود لە بەشێکی ئەم جەنگە ئاگادارە ، بەڵام لە ڕاستی‌دا .. قادسیەی صدام .. کە بە دەستێکی پۆلایی هێرشەکانی دوژمن بۆ سەر گەل‌و خاکەکەمان ڕەت دەکاتەوە لە هەمان کاتدا بە دەستێکی تر ئالای ئاشتی‌و مرۆڤایەتی‌و چارەسەر کردنی عادیلانەی نێوان ئێمەو ئێرانی دوژمن هەلگرتووەو پیرۆزبایی لە گشت ئەو هەنگاوانە دەکات چ لە لایەن دەوڵەتە موسلمانەکان‌و چ لە لایەن دەوڵەتەکانی ترو دەزگاو کەسانی بەجێی ناودارانی جیهان ، کە بۆ ڕاگرتنی شەڕ ئەنجام دەدرێت .

بۆ گشت لایێکیش ڕوون بۆوە ، کە عیراق کاتێ داوای

# یەی صدامدا بەسەر دوژمنی گومڕادا
# گی جەژنەکانی ئازار ونەورۆز دەگیڕن

ئاشتیو چارەسەرکردنی ئاشتیانەی کێشەی نێوان ئێمەو دوژمن دەکات ، لەو پەڕی بە هێزیو تواناو زاڵ بوونی بەردەوامە بە سەر تاوانبارانی تاران . ئێستاش کە نزیکەی پتر لە چوار ساڵو نیو بە سەر بەرپابوونی جەنگ تێدەپەڕێ ، «قادسیەی صدام»ی پیرۆز هەمان سەرکەوتنە مەزنەکەی رۆژانی یەکەمی جەنگی بە دەستەوەیەو وورەو ئازایەتی سەربازەکانمان هەر قایمەو قاییم دەمێنێتەوەو درێژەدانیش بە جەنگ بۆ ئێرانو کاربەدەستانی ئێران ماڵوێرانیو بەزینو سەر شۆڕی دەبەخشیو عیراقیش ئازایانە خۆی ڕاگرتووەو ئالآی قادسیەی دووەمیش ، قادسیەی کوردو عەرەب ، قادسیەی صدام هەر بەرز مایەوەو درێژەدان بە شەڕ بۆی نەکرا تۆزقالێك لە لووتکەی بلندی بیهێنێتە خوارەوەو نزمی بکاتەوە .

ئا ئەوها «قادسیەی صدام»ی پیرۆز شەڕەو ئاگرەو ماڵ وێرانی ، شکستییە بۆ دوژمن لە لایێكو لەلایێکی تریشەوە ، خۆڕاگریو ئاشتییەو هەڵوێستی مرۆڤانەیە لە لایەن حکومەتەکەمان بەرامبەر ڕای گشتیی جیهانی .. بڕوانە بایەخدانی حکومەتەکەمان بە یەخسیرەکانی ئێرانی چ بە بەردانی ئەو منداڵانەی خومەینیی جادوگەر تووشی جەنگی





کردوون و چ بە کردنەوەی قوتابخانە بۆ سەربازە بەدیلگیراوەکانی ئێرانیو چ بە بەرەڵلا کردنی بەخسیرەکانی شەڕەکانی دووایی نێوان ئێمەو دوژمن ، ئەمەو جگە لەوەی کە عیراق بەردەوام ئامادەیی خۆی بۆ شەڕ ڕاگرتن پێشانداوەو پێشاندەداتو ڕێز لە خواستی خێرخوازەکان دەگرێ بۆ ڕاگرتنی شەڕ . بەڵێ ، قادسیەی دووەم ، «قادسیەی صدام»ی پیرۆز بەرگرییە لە نیشتمانی عیراقییمانو لێدانو کوتانە بۆ دوژمنی چەپەڵ ، هەڵوێستی ئاشتیانەو مرۆڤانەش لە دەیەها کردەوەی مەردانەی پێوە دیارە لە پاڵ دەیەها داستانی ئازایانە کە لە لایەن هێزەکانمان ئەنجام دراوەو ئەنجام دەدرێت ..

نەمریو سەربەرزی بۆ شەهیدانی قادسیەی صدام سەرکەوتنی هەمیشەیی بۆ سوپاکەمانو هەموو جەنگاوەرەکانی عیراق .. سەوزبێ ئاهەنگ گێران بە بۆنەی

هەفتەی «قادسیەی صدام»ی پیرۆز ..

## بەیاننامەی ئازار

شتێکی ئاسایيو سرووشتییە ، گەلی کوردمان لە عیراقدا بە ئازادیو سەربەستیو مافەڕەواکانی خۆی بگات ، بەر لەوەی زۆربەی هەرە زۆری ڕۆڵەکانی ئەم گەلە ، کە ژمارەیان لە چەندەها ملیۆن مرۆڤ تێدەپەڕیو لە چەند وولاتێکی دراوسێیماندا دەژینو بگرە ژمارەیان تا بڵێی پترە لەو ژمارەی کە لە عیراقدا دەژی ، بەر لە وەی بە هیچ مافێک بگەن . هۆی ئەم پێگەیشتنەش ، گەیشتنی گەلەکەمان لە عیراقدا ، بە مافی نەتەوەییو لە سەروویانەوە ئۆتۆنۆمی ، بە چەند ڕووداوو بارو زروفێکی مێژوویی بە نرخ ، دەگەڕێتەوە دەتوانین لە چەند خاڵێکدا باسیان بکەین :



1 - برایەتی کوردو عەرەب ، کە ڕەگە مێژووییەکەی بۆ چەند سەد ساڵێك دەگەڕێتەوەو بۆ ئەو رۆژەی کە ئایینی ئیسلامی پیرۆز کوردو عەرەبی لە ژێر ئالآی ئیسلامدا کۆ کردەوەو ئەو برایەتی‌یە رۆژ لە دوای رۆژ پتەو دەبووو دەچەسپاو هەر کە هێرشەکانی خاچپەرستە ئەوروپیەکان بۆ سەر وولآتی فەلەستین‌و «المسجد الأقصیٰ» لە قودسدا دەستی پێکردو گەلی کوردمان پتر لە هەموو گەلانی تری ئیسلام ، شان بە شانی برا عەرەبەکانی ، تێکڕا خەباتیان دەکردو دەجەنگان‌و بەرگریان لە خاکی موسوڵمانان دەکردو خوێنی هەزاران لاوی عەرەب‌و کورد لە پێناوی سەربەزیی ئیسلام ڕژاو تێکەڵ بە یەکتر بوون .

2 - هەر چەندە ڕۆڵی جەنگاوەرەکانی کورد لە شەڕ کردن دژی خاچپەرستەکانی داگیرکەر ئاشکرایەو ڕوونە بۆ گشت مێژوونووسەکان ، بەلآم کورد هەمیشە لە گەڵ گەلی عەرەبی برا دژی گەلێ دوژمنی داگیرکەری جۆراو جۆر جەنگاوە وەك مەغوول‌و تەتارو عوسمانی‌و فارسە ڕەگەزپەرستەکانیش ، لێرەشدا کورد لە پاڵ گەلی عەرەبی برا درێغی نەکردووە لە ڕەت کردنی هێرشی هەموو دوژمانی کوردو عەرەب . بە پێچەوانەوە ، مێژوو دەیەها جەنگ‌و شەڕی تۆمار کردووە لە نێوان کوردو ئەو داگیرکەرانەی هەوڵیان داوە گەلی عیراق بۆ داواو خواستی خۆیان مل کەچ کەن .

3 - لە سەردەمی نوێشدا ، بە تایبەتی لە سەدەی بیستەم ، دوای ئەوەی دەسەلآتدارە عوسمانی یەکان نەمان‌و ئینگلیزە داگیرکەرەکان عیراق‌و گەلێ وولآتی تریان لە ناوچەدا خستە ژێر دەست . کوردو عەرەب بەرامبەر داگیرکەری نوێش ، خۆشەویستی‌و برایەتیان بەرامبەر یەکتر نوێ کردەوەو ئازایانە دەستیان دایە چەك‌و دلێرانە



بەرنگاری بەریتانیای داگیرکەر بوون و ئاگری شۆڕشی ساڵی 1920 یان هەڵگیرساندو ، لە سەرانسەری عیراق ، کوردو عەرەب تێکڕا سنگی خۆیان دایە بەر گوللەی دوژمنی تاوانبارو گەلێ سەرکەوتنی مەزنیان وەدی هێناو مەترسیان خستە دڵی دوژمنی داگیرکەرو ، دوای شۆڕشی بیستەم ، عەرەب و کورد بەردەوام بوون لە سەر تێکۆشانیان و هەموو ڕاپەڕین و شۆڕشەکانی عیراقیان بە هاوبەشی ئەنجامدا .

بەلێ ، خەباتی هاوبەشی هەردوو نەتەوەی برا ، بە درێژایی مێژووی کۆن و نوێ ، هەردوو نەتەوەی زیاتر لە یەکتر نزيك کردەوەو بوون بە پاڵپشتی یەکتر بەرەو گەیشتن بە مافی نەتەوەیی و دیموکراتی . بەلام خەباتی هاوبەشی و برایەتی و دڵسۆزی نێوان عەرەب و کورد بە تەنیا نەیتوانی هەموو ئاوات و خواستەکانی ڕەوای کورد بهێنێتە دی و بە پەیدا بوونی پارتی بەعسی عەرەبی سۆشیالیست و سەرۆکی تێکۆشەر هەڤال صدام حسین ، خودا بیپارێزێ و تەمەنی درێژ بکات . بە پەیدا بوونی ئەم هێزە پێشڕەوە لە سەر شانۆی بزووتنەوەی سیاسی لە عیراقدا ، کورد پتر لە جاران و بەرە بەرە لە مافە ڕەواکانی خۆی نزيك دەبووەو هەر چەندە کورد بە درێژایی هەزاران ساڵ وەك گەلێکی خۆڕاگر ماوەتەوە بەلام بە درێژایی ئەم مێژووە دووروو درێژە ، هیچ رژێمێك یا خود حکومەتێك دانی بە مافی ڕەوای نەنا بە پێچەوانەوە بەڵکو هەر دانیان بە بوونی کورد نە دەنا .

بە پەیدا بوونی هێزی سیاسیی بە توانا ، کە پارتی بەعسی عەرەبی سۆشیالیستە ، خەباتی جەماوەری عیراق و جەماوەری کورد بە تایبەتی پەرەی ساندو پێشکەوت و لە دوای سەرکەوتنی شۆڕشی 17 - 30 ی تەمووزی پیرۆز لە ساڵی 1968دا میری هەر لە سەراتاکانی مانگەکانی یەکەمی لە حوکمدا ، بایەخێکی تەواوی بە کێشەی کورد داو یاساو بڕیاری بە جێی دەرخست بۆ دابین کردنی مافی ڕەوای گەلی کورد . دوای ماوەیێکی کەم لە سەر سەرکەوتنی شۆڕش ، میری بەیاننامەی 11ی ئاداری ساڵێ 1970ی بڵاوکردەوەو پەیمانی بە گەلی عیراق و گەلی کورددا کە لە ڕۆژی 11 ئاداری ساڵی 1974دا ئۆتۆنۆمی بۆ کورد جێبەجێ بکات . ئەوەی شایانی باسە ، میری بە درێژایی ساڵانی 1970و 1974 هەر هەوڵ و کۆششی دەدا تا وەکو ئۆتۆنۆمی لە سەر بناغەیێکی قایم و پتەو بچەسپێ و دامەزرێ و پیلانی نەیاران و ناحەزان کاری لێ نەکات و دوای تێپەڕ بوونی



چوار ساڵ بە سەر دەرچوونی بەیاننامەی 11 ئاداری پیرۆز میری لە رۆژی 11 ئاداری ساڵی 1974 کارێکی گەورەی بۆ گەلی کورد ئەنجام داو ئۆتۆنۆمی ی بۆ کورد لە چوارچێوەی عیراقێکی دیموکراتی و پێشکەوتووی جێبەجێ کرد .

بەیاننامەی 11 ئاداری ساڵی 1970و دەرچوونی یاسای ئۆتۆنۆمی ی ساڵێ 1974و دامەزراندنی دەزگا دەستووریەکان بۆ چەسپاندنی مافە ڕەواکانی گەلی کوردمان و پاراستنی ئەم مافانەو پەرەپێدانیان ، بە دەسکەوتێکی مەزنی شۆڕشی 17 - 30ی تەمووز دەژمێردرێت ، میریش بە دەرکردنی یاسای ئۆتۆنۆمی بۆ کوردو چارەسەرکردنی کێشەی کورد گەلێ کاری پیرۆزی ئەنجامدا . چونکە دان بە ماف کورد ، برایەتی ی نێوان هەردوو گەلی برا بە هێزتر کردو یەکێتی ی نیشتمانی ی جەماوەری گەلی عیراق هێنایە دی و پیلانی ئیمپریالیزم و زایۆنیزم و نۆکەرانیان لە کاربەدەستەکانی ناوچە بە تایبەتی کاربەدەستانی ئێران کە بازرگانیان بە کێشەی کورد دەکرد ، پووچەڵ کرد . ئەمەو جگە لەوەی ئەو بەیاننامەیە ئاوات و خواستێکی یەکجار گەورەو پیرۆزی بۆ کوردی عیراق جێبەجێ کرد . ئەو بەیاننامەیەی کە هانی هەموو تێکۆشەرەکانی کوردی لە دەرەوەی وڵاتدا ، بە تایبەتی لە ئێراندا ، کە ڕاپەڕن و زوڵم و زۆرداری و ستەم چی تر قەبووڵ نەکەن و خەبات بکەن بۆ دووا رۆژێکی خۆشتر .

بەلێ ، بەیاننامەی 11ی ئاداری پیرۆزی ساڵی 1970و دامەزراندنی ئۆتۆنۆمی بۆ گەلی کورد لە کوردستاندا ، یەکێکە لە دەسکەوتە هەرە مەزنەکانی شۆڕشی تەمووز ، ئەو دەسکەوتووانەی ڕووی عیراقیان بە تەواوی گۆڕی و لە دەوڵەتێکی پاشکەوتووی گواستەوە بۆ دەوڵەتێکی هاوچەرخی پێشکەوتوو ، ئێستاش کە ئاهەنگ و زەماوەند بەم بۆنە ئازیزە دەگێڕین ، دووپاتی دەکەینەوەو دەبێژین ، مان هەر بۆ ئۆتۆنۆمی بووەو دەبێ لە بەهاری ساڵی 1974 تا ئەو بەهارەو هەموو بەهارێکی داهاتوو نەمان و دۆڕاندن و شکستیش هەر چارەنووسی دوژمنانی گەلەکەمانە ، ئێستاش ئەو دوژمنە چەپەڵە نەك هەر دان بە بوونی کورد لە ئێراندا نانێ ، بەڵکو هێرشێکی دڕندانەو خاچپەرستانەی بۆ سەر کوردەکەی خۆی



دەبات و ژن و منداڵ و پیرەمێردی لێ دەکوژێ و شارو شارۆچکەو گوندی بە سەر دەڕووخێنێ و ئاگر لە دەغلو سامانی بەردەدات و قنارە بۆ لاوەکانی دادەمەزرێنێ و تەنها ئاووردانەوەیەك بۆ باری ئێستای ئێرانی دوژمن ، ڕاستی ی ئەم قسانەمان بۆ دەردەخات .

لە بیرەوەری ی ئاهەنگ گێڕان بە بۆنەی رۆژی بڵاوکردنەوەی بەیانی 11 ئاداری ساڵێ 1970و دەرچوونی یاسای ئۆتۆنۆمی ساڵێ 1974 . پەیمان و بەڵێنی وەفاداری بۆ پێشەوای کاروانی گەلەکەمان تێکۆشەری مەزن صدام حسین ، خودا بیپارێزی ، نوێ دەکەینەوە ، کە هەتا هەتایە ئەو ئۆتۆنۆمی یەی بۆ کوردی دامەزراند بیپارێزین هەر وەکو چۆن بیبیلەی چاوی خۆمان دەپارێزین ، ئیتر هەر بژی کورد . بژی ئۆتۆنۆمی .. بژی بەرایەتی کوردو عەرەب ..

## نەورۆز ..

لە گەڵ بەرەبەیانی رۆژی یەکەمی بەهار بەپێی ساڵنامەی کوردی ، جەژنی نەورۆز لە وڵاتەکەمان لە دوای



سەرکەوتنی شۆڕشی 17 — 30 تەمووزی پایەداردا ، بە خۆشیو کامەرانی لە لایەن گەلەکەماندا دەکرێت . لێرەدا ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێو زەماوەندەکانی نەورۆز بە چێژتر دەکات ئەوەیە کە میری توانی هەموو ڕۆژەکانی مانگی ئادار بکاتە شاییو ئاهەنگ ، بگرە لە ئاهەنگ گێڕان بە بۆنەی 11ی ئادار لە سەرەتای مانگەوە تا ئاهەنگ گێڕان بە بۆنەی قادسیەی صدامی پیرۆز لە کۆتای مانگەوە ، ئەمەو جگە لە مەش میری نەك هەر نەورۆزی کرد بە جەژنێکی ڕەسمی بۆ کورد بەڵکو بۆ هەموو گەلی عیراق . لێرەدا جەژنەکە فراوانترو خۆشتر بووە چونکە جاران بە ترسو لەرزو بە شێوەیێکی نهێنیی دوور لە دامو دەزگا تۆقێنەرەکان دەکرا . کردنی نەورۆز بە جەژنێکی ڕەسمی بۆ هەموو هاوولاتیانی عیراق ، بە دەسکەوتێکی نەتەوەیی گرنگ بۆ گەلی کورد دادەنرێتو برا عەرەبەکانیش بە سەربەستی هاوبەشی برا کوردەکانیان/دەکەن لە ئاهەنگ گێڕان بەم بۆنە پیرۆزەوە ، بە پێچەوانەی سالانی بەر لە بەرپابوونی شۆڕشی 17 — 30ی تەمووز کە دەسەلاتداران شادیان لە رووی خەلك لە سێدارە دەداو زەردەخەنەی سەر لێویان بەند دەکردو بە زەبری ئاسنو پۆلا ئاگری نەورۆزیان دادەمرکاند کاتێ ڕۆلەکانی کورد شەوان بە نهێنی لەم لاولەو لاولە سەرانسەری کوردستاندا ئەو ئاگرەیان دادەگیرساند .

کەچی ئێستا ، بە پێچەوانەی ڕۆژانی ڕابووردوو میری خۆی نەورۆز دەکاتو بەرگری لە مافو زەماوەندی کورد دەکات .

بەلێ ، شتێکی ئاسایییە ، کە حکومەتی ئێمە ، تاکە حکومەتە بە درێژایی مێژوو ، کە دان بە نەورۆزدا بنێ وەك جەژنێکی ڕەسمیو ئاشکرا بۆ کورد ، ئەوەی شایانی باسە ، نەورۆز وەك جەژنێکی نەتەوەیی بۆ کورد ئاهەنگ گێڕان بە بۆنەی قەدەغەیە لەو وولاتانەی کە کوردی تیادا دەژی ، ئەگەر



بشكرێت ئەوا بە نهێنی دەكرێت ، گەر ئاشكراش بوو ئەوا سزا دەدرێت !

ئەوانەی بە درۆ فرمێسك بۆ كورد دەرێژن بە تایبەتی كاربەدەستانی قومو تاران ، ئەوا لە وولاتەكەی خۆیان بە هەموو هێزو تواناییكیان لە كورد دەدەنو كورد سەر دەبڕنو

هەر بانگەوازێكیش كە داوای ماف بكات بۆ كورد ، لە ئێراندا بە پێچەوانەی ئیسلامی دادەنێن ، هەر كەسێك داوای ئۆتۆنۆمی بۆ كورد بكات ، بە دەرچوون لە ئایینی ئیسلام لە قەڵەم دەدرێت . نەك هەر ئەمە بگرە هەتا هەوڵدان بۆ ژیانێكی پڕ هێمنیو ئاسایشو دوور لە مافی نەتەوایەتیش ئەوا بە زیان لە قەلەم دەدرێت دژی ئیسلامو بە پیلانێكی عیراقی دەژمێردرێت !

بەڵام هەروەكو دەبێژن ، تیشكی رۆژ بە بێژینگ ناگیرێو هەروەها رێرەوی مێژوو بەرەو دواوە ناگەڕێتەوە هەروەكو چۆن ئاوی ڕوبار بەرەو سەرچاوەی خۆی ناكشێتەوە ، دەبێو چار نییە ، خۆری سەربەستی بۆ كوردی ئێران هەر هەڵبهێت زوو یا درەنگ ، دەبێ خەباتی چەكدارییان دژی تاقمی خومەینیی بێ مێشكو ڕەگەزپەرست سەر بگرێو زوڵمو زۆرداری لە ئێراندا نەمێنێو لە كۆتاییدا دیموكراتیەتو ڕاستیو كوردو عەرەبو ئازەریەكانو بلووش هتد لە نەتەوەكانی ئێران سەركەوونو ئاگری نەورۆز بە سەربەستیو ئاشكرا بكەنەوەو تاقمی بەكرێگیراوی تاران لە ناو بچێت .

بەڵێ ، تۆقاندنو ستەمو زۆرداری هەر چەند تەمەنی درێژ بێ بەڵام ئەنجامی هەر نەمانەو لە ناو چوونەو لە كۆتاییدا هەر ئازادیو یەكسانیو نەورۆز سەر دەكەوون .

ئیستاش ، چۆن گەلی كوردمان لە عیراقدا خۆشحاڵەو بە سەربەستی ئاهەنگەكانی نەورۆز ئەنجام دەدات لە سایەی شۆڕشی 17 — 30ی تەمموزی پیرۆزو حوكمڕانی پارتی بەعسی عەرەبی سۆشیالیست بە سەركردایەتی پێشەوامان صدام حسین بنیاتنەری عیراقی نوێو ئۆتۆنۆمیونەورۆزو بەهاری سەوزو شادی بۆ كورد ، دەبێ كوردی ئێرانیش رۆژێك بێت بە سەربەستی ئاگری نەورۆز هەلگیرسێنێو بە سەربەستی تامو چێژ لە مافی نەتەوەیی خۆی وەربگرێ ، دەبێ خۆری سەربەستی بۆ كوردی ئێران هەڵێ ، چونكە عیراق پشتیوانی كوردە ، گەلێكیش عیراقی 17 — 30ی تەمموز پشتیوانی بێ ، مەحالە سەركەوتنی بۆ دابین نەكرێ ، دەبێ هەر بە ئازادیو سەرفرازیو نەورۆزو كامەرانی بگات .. بەرز بێ ئاگری نەورۆز ..

# نەورۆز ..



## ڕوونکردنەوەیەك

بڕیارمان وابوو کە لە ژمارە «29»ی گۆڤارەکەمانەوە هەر جارەی تابلۆی هونەرمەندێکی کورد لە بەرگی یەکەمیدابێ و ، تابلۆی هونەرمەندێکی غەیری کورد لە بەرگی دووەمدابێ . بەڵام بەداخەوە لەم ڕووەوە دوو هەڵە کەوتۆتە ژمارە «29»وە ، یەکەمیان : تابلۆ کوردی‌یەکە کەوتۆتە بەرگی دووەم و ئەوی‌تر بەرگی یەکەم .

دووەمیشیان : تابلۆکە دەستکردی هونەرمەند «دارا محمد علي» یە ، نەك هونەرمەند «محمد عارف» ، داوای لێبوردن دەکەین .

«کاروان»



# له شیعری کوردیدا

بازێڕو کەلاتو خانی بەردان
تشبیه بە نژدەیانو جەردان
صف صف دمشینە کوهـو دەشتان
رەڤ رەڤ دخوشینە سەیرو گەشتان
اصناڤ امم صغارو کبار
قطعا ڤەنەما د شەهری دیار
هندەك بە پیایی چونە باغان
هندەك بە سواری چونە راڤان
ئەو بو کو چ طالبو چ مطلوب
یعنی دو طرف محبو محبوب
ئەڤ هەردو جلب کو هەڤ ببینن
کفوی دخوە ئەو ژ بو خوە بینن

صحراو چەمەن دکرنە مسکن
بەیداو دەمەن دکرنە گولشەن
خاصما عزبو کچی دباکر
القصة جواهری دنادر
تێکدا دمزینو ملبس
ڤێکڕا ل تفرجی مرخص
لکن نە بە تهمتو بە منت
بەلکی بە طریقی شرعو سنت
لەوڕا کو ئەوان غرض ژ گەشتی
مقصود ژ چونی ئەوان ب دەشتی

ئەحمەدی خـانی

* * *

دانای معمری کو هەن سال
ئەڤ رەنگهە کو ژ بو مە احوال
کو عادەتی پێشی یی زەمانان
ئەڤ بو ل هەمی جەهـو مکانان
وەقتی وەکو شەهسواری خاوەر
تحویلی دکرە ماهی آزەر
یعنی کو دهاتە بورجی سەر سال
قەت کەس نەدما د مسکنو د مال
بالجملە دچونە دەر ژ مالان
حتا دگەهشتە پیرو کالان
رۆژا کو دبویە عیدی نەورۆز
تعظیم ژ بو دما ل دل ئەفرۆز

بلێ جارچی‌یان نەورۆز جارمدان
جاری پا دشایی نەو بەهارم دان
بادەی وادەی وەشت جەکۆسار مەیۆ
یاران مزگانی نەو بەهار مەیۆ
پادشای بەهار وادەی وەختشەن
بەتەعجیل مەیۆ ئامای وەختشەن
وەختەن شای بەهار نبییشۆ نەدەور
جاڕ بکێشۆ رەعد نەتەپل هەور
وەختەن بگێڕۆ دووی دەشتو سارا
کەوکەبەی بەهار وێنەی شای دارا
وەختەن بەیۆبەرا ئۆردووی گولاڵان
گییران دەشتو دەرچوون هەرد جاڕان

**وەختەن بیۆن بەرگوڵان هەزار دەنگ**
**چرمە زەردو سوور چوون دیبای فەڕەنگ**

**سەیدەی هەورامی**

## نـــەورۆز

بەســووڕێکی تر ئەســتێرەی ئینسان گــر
قەومی کۆنی خســتەوە جــەژنی ئاگـــــر
کام قەومی کۆن ، کام جەژنی بەرزو پیرۆز؟
قــەومی مادی . جەژنی بڵنــدی نــەورۆز !
ئەو نەورۆزەی کــە هەزاران بەهـــــارە ،
لەرێی کوردا گـــڕی ئاگـــری دیارە ..
باوباپیرمــان هەتــا ئــەڕۆن پشــتاو پشت،
لەم ئاگرەیان دەورە داوە چینچین ، گشت.
لەچوار دەوری ئــەم ئاگرە رەنگاو رەنـــگ
کۆڕ گــیراوە بەپێکــەنینو ئاهـــــەنگ
بانگی شــێوان هــەتاکو بــــەر بــەیانی
چۆپی بووەو بـــــەزمو نۆشو گـــۆرانی
لەوســـاتەوە تا ئێســتاکە بــەم چەشـــنە
هەموو ســەری ســالی تازەمان جــەژنە
میوانی کۆن بـــــەڕێ ئەخـــەینو تــازە ،
بەپێکـــەنین ئەگاتــە بـــەر دەروازە ..
خۆشیت هێنــاو فەڕت هێنـــاو شــیرینی !
تۆ بۆ ئێمــە بەهەشــتی خــەو بینینی ..
بە هاتنت بــای بەســتەڵەك بەفری دەشت ،
گیانی سپارد گوڵی ڕوا جێگـــای گەشت .
لە تــاریکی لــە چوار دیواری زســـتان ،
سەرفرازبیت ! ســەرفراز بو مــەلی گیان !
ئێســتا ئۆخەی ئاسمانێکەو هـــەتاوی ،
گیـــایەو گوڵەو مەلــەو خوڕەی چـــەماوی
چی خۆشــترە لەوەی تەبیعــەت جوان بێ ؟
ماوەی سەرنج پانایی گشــت ئاسمان بێ ؟
گیانی سـەرمەست ، باڵداری ڕێی هیوا بڕ ،
بەرزبێتەوە بە پەڵەی هـــەور بــدا دڕ ؟
بفــڕی بــڕوا بۆ کوردوستانی ئـــاوات ،
ماندو نــەبێ ، هــەر بڕواتو هــەر بڕوات
هەتــا ئەگاتــە لوتکەی شـــاخی سەربەست
بێ زنجیری گەل ئەبینێو ئـــەبێ مەســـت

**گۆران**

بەهــەوری نــەورۆز گوڵ چــاوی شــۆڕبا
توو ، پیــاڵە ، شــەراب ، دامێنی چیســـا
ئیمــرۆ تێــر ســەیری ســەوزە گیــا بکە
ســبەی لە خــاکت ســـەوز ئەبێ گیـــــا

**سەلام**

بومردان زەێین گولشـــەن چیمــەن لالە پشکفتن
بنەفشو چیچەکان ڤێکرا شەفەق دانێك د رەوزێدا

■ ■

ئەو لالەیی گوڵ تازە تەڕ فەسلا بەهار کوو تێنەدەر
جی بهەڤرا تێنەدەر خۆشخۆش دعەردو خــارەدا

**مەلای جزیری**

بۆ گوڵی رووت هاتمو پەرچەم ئەبێنم بۆیــە وا :
ماهی نەورۆزم بە شێوەن وەك محەرەم خۆش نوواند

**حەریق**

گوڵی سوور ئەی کچی نەورۆز ئەرێ کام دەس لە باخی ژین
لەبۆ یەك دەفعە بۆن کردن بە ناکامی ئــەتۆی هێنــــــــا

**دڵدار**

## نەوروزانە « گۆرانی »

مژدەبێ ، ساڵ گەڕایەوە    ئاگری نەوروز کرایەوە
بەفری زستان توایەوە    گیا ، وگوڵ ، ودڵ ! ژیایەوە

نوخشەیش بێ لە کوردی هەژار .

گوڵ ، لەباخا ، خۆی دەنوێنێ    بلبل بەڕوویا ئەخوێنێ
هەور ، مرواری دەپرژێنێ    شەماڵ ، ژینو ژیان دێنێ
نێرگس مەستەو چاو بە خومار

**پیرەمێرد**

دەستەی قوتابی کچو کوڕی وورد
نەوەی کەلوررو زازاو هەموو کورد
لە قوتابخانە شێرانە وەك گورد
ئا ئەم بەیانیە ئەمەیان ئەووت
وەتەن نەورۆزە نیشانەی بەهار
دەك پیرۆزت بێ نەك جارێ سەد جار
تا دوشمن بمرێ دۆستیش بە شادی
بژیو ببینیت رۆژی ئازادی

**ا. ب. هموری**

## نەورۆز

نەورۆز گوڵالەی نایە سەر پەرچەم
نێرگسی رشتە دەشتو کەنار چەم
لەگەل تواتەوەی سەهۆڵ چرۆ
تیایا توایەوە پرشنگی ئاسۆ
ئەم رۆژە تەنیا بۆ بەهار نیە
هەر جەژنی گوڵو لالەزار نیە
یادی رۆژێکە کوردی قارەمان
قەڵا سەختەکەی دوشمنی ڕمان
کورد دلێرانە خۆی ئەدا بە کوشت
بۆ ئازادی بوو خوێناوی ئەڕشت

**کامەران**

کوردستان بەهەشتی زەمین
جێی تێکۆشانو راپەڕین
**مەلبەنی کاوەی قارەمان**
کوردستان ، کوردستان

ئەی نەتەوەی کوردی دلێر
رۆڵەی نەبەردو بێچوە شێر
هەستە هەستان دەرمانە بۆ
دەردو ئازاری جەستەی تۆ

کوردستان ، کوردستان

وا نەورۆزە جەژنی گەلە
ئاسۆ رازاوەی دەم کەلە
با نەورۆزو بەهاری کورد
پێ‌گەێنین بەدەستو برد
کوردستان ، کوردستان

**محمد صالح دیلان**

**سوپای سەختی کشایەوە**
**هێزی سەرما کشایەوە**
**سەهۆڵی کێو توایەوە**
**بەهارە گوڵ بۆژایەوە**
**دەشتو دەرکێوو بەیار**
**باخو ڕەزو چۆمو رووبار**
**کشتی بەهۆی فەسڵی بەهار**
**دووبارە وا ژیایەوە**
**داروباری دەشتو چیا**
**مێرغوزاری جووانی گیا**
**کشتی کەوتنە رەقسو سەما**
**گوڵزاری هەمووی رازایەوە**
**رازایەوە باخو چەمەن**
**بەئەرخەوانو یاسەمەن**
**بولبول خوێندی لەناو گولشەن**
**خونچە دەمی کرایەوە**
**بنەوشەو بەیبوونو لالە**
**نەسرینو سوسەنو ژالە**
**هەروا نێرگسو هەڵاڵە**
**شەونمیان لێتکایەوە**
**پۆرو قازو قولینگو کەو**
**ئەخوێنن رۆژو شەو**
**شەهێنو باز بووینە پێشڕەو**
**غەمی دڵیان برایەوە**
**گوزەرگا ئەکا بادی شەماڵ**
**بەسەر دەشتو بەرزاییو چاڵ**
**هۆشیار ئەکا بیرو خەیاڵ**
**دەروونی دڵ حەسایەوە**
**بەهارە خاکی نیشتمان**
**بووینە بەهەشتی رووی جیهان**
**ڕەگی شادی پیرو جووان**
**بناغەی‌دا کۆتایەوە**

کەریم شارەزا

# بۆ نەورۆزی.. 1985

مدحت بێخەو

نەورۆزەکەم
ئەی ڕوانگەی چاوی هۆزەکەم
مایەی سووتان و سۆزەکەم
ئەی ڕۆژی نوێ ..
هەستم بیرم خورپەی دڵم
بۆتۆ ئەدوێ
ئەی بەهادار
جەژنی دوا ڕۆژی کڵۆڵ و
پاڵە و جوتیار
ئەی بووکەکەی (هیر) بەستراو(1)
بۆ گواستنەوە
ئەی هەزاران ساڵ چاوەنوار . !
بۆ ئامەنگت هەندە شەیدام
لێم تۆراوە ئوقرە و ئارام
نازانم چۆن واتەی وشەم
بۆت والاکەم . !
چۆن ئاوازی بلبلەکانی ناوسینەم
بەرەللاکەم ..

زۆر دەمێکە سرووودێکم لەناو دڵدا
بۆت داناوە
نە ئاوازی بۆ دادەندرێ
نە هیچ کەسیش پێی دەگوترێ
ئەی بووکی ساڵ
دەروون ئاگری تارا ئاڵ
زویر مەبە ..
سینەی منیش وەك تو گڕە
ناخی دڵت دەخوێنمەوە
بۆ ژوانت ..
چەند ئێمە بۆت چاوەڕوانین
هی‌تۆ سەد هەندە پترە
کێ نازانی بۆ هاتنە ڕووت
چاوەڕوانی تۆ ڕاستترە . !

* * *

(1) هیر = بەخت

# پیرۆزبایی له دوو جه‌ژندا

**پیربال مه‌حمود**

**[ له نه‌ورۆزی ساڵی (1967) دام نـاوه ، جه‌ژنی نـه‌ورۆزو جه‌ژنی قوربان به‌رێکه‌وت که‌وتبوونه یه‌ك ڕۆژ ]**

له‌گه‌ڵ ده‌رچوونی خۆری جه‌ژنی قوربانم له به‌نده‌ندا
چریکاندم له‌هێلانه‌م ؛ ووتم : ئه‌ی گوڵ چ باسێکه ؟
چی‌یه ؟ بۆ واگه‌رووی‌کانیت کپه ؟ بۆچی له‌به‌نده‌ندا
سه‌راسه‌ر ناخی ڕووبارت ، وه‌کو ناخی که‌ساسێکه ؟
له‌به‌رچی واگه‌راقوپی ؟ چ قه‌وماوه له‌گوڵشه‌ندا ؟
له‌به‌رچی ڕووت له‌به‌ردیده‌م وه‌کو ڕووی خوانه‌ناسێکه ؟
سه‌رنجی بۆ ته‌لاران به ، چ به‌زمێکه له ئاهه‌نگدا ؟
ئه‌تۆش به‌زمت نی‌یه ، هه‌شبێ به‌عاسته‌م ئینعکاسێکه !
چی‌یه ؟ بۆچی په‌شوکاوی ؟
له‌به‌رچی سیس‌و ژاکاوی ؟
ده‌خێراده‌ی ، بڵێ ئه‌ی گوڵ چ باسێکه له چیمه‌ندا ؟

* * *

له‌هه‌رلایێکی دنیادا ؛ له‌هه‌رکونجێکی بێ‌ئاسته‌نگ
جم‌وجۆڵ‌و زه‌ماوه‌نده به بۆنه‌ی جه‌ژنی پیرۆزم
په‌ری شادی به دوو باڵی که‌ژاڵی دێته نێو ئاهه‌نگ
ئه‌گێڕی چۆپیێ شه‌نگتر له‌چۆپی کوڕی نه‌ورۆزم
نوێژگه‌ی پاکی خواناسان به‌ویردی سه‌رده‌م وده‌رده‌نگ
ڕوواوه ، وه‌ك چرۆی ئاڵی نه‌مامی زایه‌ڵه‌و سۆزم
ئه‌دی بۆ گوڵشه‌نم چۆڵه له ئاراییشی ڕه‌نگاوڕه‌نگ
که‌چی هی خه‌ڵکی جه‌ژنێکه ؛ دووه‌ هی میلله‌ت‌و هۆزم
چی‌یه بۆچی په‌شوکاوی ؟
له‌به‌رچی سیس‌و ژاکاوی ؟
نه بانیژه‌م دیاره ، وه‌ی !.. نه‌سازو تارو زیل‌و زه‌نگ

* * *

ووتی : هه‌ی هه‌ش‌به‌سه‌ر بولبول ، ئه‌وێستا بانیژه‌ی شه‌نگت
وه‌کو زانیومه گیراوه ؛ له‌ژێر چرنوکی هارانه
که‌یفگه‌ی جه‌ژنی پیرۆزت ، که‌وا مه‌ست‌بوو به ئاهه‌نگت
که‌لاوه‌یه‌کی ڕووخاوه ، نه‌ڵێی وه‌ك جاری جارانه
به‌کێ دڵخۆش بکه‌م ، یاخود به‌کێ دڵخۆش بکه‌ی هه‌نگت
له‌سه‌ر خونچان کشا ، شانه‌ی له نێو قوڕگی نه‌یارانه
نه‌که‌ی واتێ‌بگه‌ی جه‌ژنه ، نه‌که‌ی واتێ‌بگه‌ی ده‌نگت
له گوێی چینی جوانکاران وه‌کو ده‌نگی هوزارانه
ته‌ماشای خۆت‌که که‌ژاکاوی ،
وه‌کو من واپه‌شوکاوی ..
وه‌ره ئێره بناڵێنه به‌رامبه‌ر باخی بێ‌ڕه‌نگت !

* * *

که‌دیم شاگوڵ له‌پێش پۆلی گوڵان گریا له‌چه‌مبه‌ردا
ووتم : گیانه هه‌تاماووم ، ئه‌من پارێزه‌ری باخم
به‌ڵێن‌بێ ، تاپه‌ڕێ مابێ ، له‌جه‌سته‌م ؛ یاله‌شاپه‌ڕدا
بلاوێنم چرۆی دارت له دامێنی چیاوشاخم
پرۆزبایی نه‌که‌م ، یانا نه‌ڵێم جه‌ژنه له گۆڤه‌ندا
ئه‌گه‌ر بۆم نه‌کرێ بۆت بێنم نویدی(1) ناخت وناخم
که‌چی ئه‌ی گوڵ دڵی هاران وه‌کو به‌رده له به‌نده‌ندا
به‌لام پووشه له‌پێش گڵپه‌ی به‌تاوی داخت وداخم
ئه‌بێ چیتر به‌ژاکاوی
نه‌ژی .. یاخوود په‌شوکاوی ..
نه‌بینم هیچ له سه‌ر ڕووت وسه‌روگوێلاکی گوڵشه‌ندا !

**هه‌ولێر** : 1967

---

(1) نوید : مژده

# نەورۆز ئاوا پەیدابووە

● [illegible] ●

**گڕبارینە ؛ گڕبارینە**
**هەر لوتکەیەك کە ئەبینی**
**هەر ئەشکەوتێ کە ئەدوێنی ..!**
**چراوگێکی بەتینە**
**ڕۆنی « گڕانی » دارگوێزە ..!**
**بۆیە بڵێسەی بەهێزە**
**زەنگڵە قڵیشەی ئاگرەکەی**
**پشکۆی گەشی « کوانوو » ەکەی**
**بیری تیژی جۆراو جۆرە**
**ئەزمونی چزی ناسۆرە ..!**
**هەڵگیرسانی ئەم تەنوورە**
**داربەڕووی تەمو ئەستوورە**
**ڕیشی لاوە ، پرچی کچانی ئاڵۆزە**
**نێڵەنێڵی ئەم نەورۆزە**

● ✱ ●

**پۆنگی ڕقی دڵی زەوی ..!**
**لێزمە تەرزەی « هێلکە کەوی»**
**چاوی نەرگزی خەواڵوو بێدار ئەکا**
**وەنەوشەی نوقمی جۆگەی لێل**

هەلاڵەی ئاڵی هەردەوێڵ
لەگیانەڵا ڕزگار ئەکا
لە زستاندا بەفر باری
بۆ نەتەوەی کوردی ئاری
لەبەهاردا باران چەندجار پەڵەی داوە !
چڵك گەردی دێرینی دڵ ؛ چاك خووساوە
گرمەو نرکەی هەورە تریشقە
جەرگی مێرغوزاری سمی و خوێن بە فیشقە ..!!
فووارەی داوە
خوێن لافاوە ..

● ✱ ●

ئەم نەورۆزە
ئاسمان تەمو تەپو تۆزە ..!
گوڵاڵە بۆیە وا مۆرە ..!
جێی نسرمەو دوور لە خۆرە
ئەرخەوانیش « تارا » ی شینە !
کۆستی لە « لا » هەڵپەڕینە .. !
نەورۆز ئاوا پەیدا بووە
بۆیە « وا » بەرزو زیندووە ..!

# کوڕگەل

● لطیف بەرزنجی ●
هەولێر ـ ئاوایی قەتەوی

ئەم پارچە هەڵبەستەم پێشکەشە بە هەموو کوردێکی دڵسۆزو نیشتمانپەروەری دوورو نزیک ، بەبۆنەی جەژنی نەورۆزی پیرۆزەوە ، لەگەڵ چەپکە نێرگزی شاخو کێوانی کوردستان ..

کوڕگەل لاوانی تێکۆشەر
ڕۆڵەی نەبەزو خەباتکەر
ئەمرۆکە هەموو کوردستان
وەکو بووکی ڕەنگینو جوان
بەرگی گوڵی شاخو هەردی
شارو لادێ دارو بەردی

* ● *

کۆچی کرد سەرما ، بەفر تواوە
ئەم کوردستانە بە گوڵ ڕازاوە
ئەو گوڵەی ڕوا بەخوێنی ڕۆڵە
بۆتە دروشمی خەباتو تۆڵە
گوڵاڵە سوورەی کێوانی وولات
نەخشاندی لانەی شۆڕشو خەبات
کوردستانەکەی سەنگەزی شێران
قەڵا سەختەکەی سوپای دلێران
مەڵبەندو بنکەی لەشکری لاوە
شۆڕە سوارانی چالاکی کاوە

* ● *

زرمەی پێی ئەسپی دلێران
سروودی گەرمی تێکۆشان
هۆرەو قەتارو حەیران بوو
لاوك چیرۆکی مەیدان بوو
لەگەڵ ئاوازی شمشاڵا
لەناو لافاوی خەیاڵا
ئەو قەڵاو کۆشكو کەلاوە
بەسەریەکدا کە ڕووخاوە
هەوارگەی کۆچو ، خێڵو ڕێبوار بوو
سەیرانگەی دەوارانیش ، بەهار بوو

* ● *

یادی ئەو ڕۆژە بابکرێتەوە
شۆڕشی کاوە زیندوو بێتەوە
چەکوش وەشێنو گورزی پالەوان
زۆرداری گەلی لە خوێنا گەوزان

* ● *

لەگوێی گشت کوردێ بزرنگێتەوە
ژیلەمۆی ئەوسا بگەشێتەوە
گڕو بڵێسەی نەورۆزی کاوە
جەژنی رزگاری کوردی جێماوە

* ● *

پیرۆزبێ لە گشت لاوانو پیری
لە گەلی کوردی نیزیكو دووری
لە ئاوارەو لە دەربەدەر
لە هەموو کوردی خەباتکەر
سڵاو و جەژنە پیرۆزە
پێشکەش بەکوردی دڵسۆزە
لەگەڵ پۆلی شەهیدانی
کە بۆ کورد بوونە قوربانی

# کەژاوەی نەورۆز

عبدالخالق سەرسام
هەولێر

بلێن بە هەورە تریشقە
بەسیە گرمە لە دەوەنێ
با رۆژ سەرتاسەی زێرینی
لەسەرکات و پێ ، بکەنێ
ئەوا کەژاوەی نەورۆز دێ و
زستان کۆچباری تێك ئەنێ

* * *

بلێن بە بەفری ریش سپی
با لەشەرما بتوێتەوە
قۆڵ لە ملی چیا بەردا
بەبیوون و مێخەك دێتەوە
کیژان دەچن بۆ رێواسان
دەرگای ئاسمان دەکرێتەوە
ئەوا کەژاوەی نەورۆز دێ
بەهار باوەش ئەگرێتەوە

* * *

بەچیمەن و گوڵزار بلێن
بە جۆگەلەو رووبار بلێن
بە کانی و بەردو دار بلێن
جلی ئاهەنگ لەبەر بکەن
نەورۆز بەرێکەوت وا دەلێن
خۆشەویستی دابەش ئەکا
دێوو درنج دەبا هەلێن

* * *

پەری زادە هەڵسە دەتۆش
گۆرانی کوردیم بۆ بلێ
بەچەنگ گوڵت پێدا دەکەم
نێرگز دێنم بە هەنگلێ
ئاگری نەورۆز دەکەمەوە
گەرمی بدا بەگشت دلێ

* * *

# پیاهەڵدان بە بەهاری کوردستان و خۆشی نیشتمان دا

● د. شۆ ●

هاتەوە سروەی سەبا نەورۆزە کاتی نەوبەهار
گوڵ ئەدا مژدە بە بلبل بەس بکا با ئاهووزار
هەرئەڵێیت تێراو بە خوێنی عاشقانە لالەزار
یازدەی سێی نۆسەدو حەفتابوو کوردی ناودار
بوو بە دوو جەژنی تەواوی جەژنی ڕزگاریو بەهار

* * *

ساگری نەورۆز بلێسەی داوەتە دەشتو چیا
بەربوەتە عومری زستان واهەناسەی لێبڕا
ئەم ترش ڕوخسارە ڕۆیشت هات بەهاری دڵ گوشا
وا لەسایەی خواوەیە دارو دەوەن ڕووتی نەما
یاخوا پیرۆزبێ بەخۆشیو کامەرانیو بەختیار

* * *

با کەمێ بدوێم لە باسی ئەم بەهارە ئەیبرا
ئەرخەوان ئالای ئالی وابەسەردا ڕاکشا
گیاو گوڵو دارو درەخت بووژایەوە ڕووتی نەما
بەرگی شینایی تەواو پۆشیوە لاپاڵو چیا
ئاڵو والایە بە گوڵ ڕازاوەیە سەرتا بەخوار

* * *

قەسری فردەوسی بەرین کوێستانی کوردستانمە
گوڵشەنو باخیجینان سەیرانی کوردستانمە

هەرچی مەدحێکی بکەم شایانی کوردستانمە
نەك دڵێ سەد دڵ بڵێ حەیرانی کوردستانمە
ناکرێ تاریفی بۆمن با لەکورتی بێ‌وتار

* * *

ڕۆڵەکانی هەرچی دەیبینی بە چەشنی (کاوە)یە
ڕوو لەهەرلایەك دەکەی خۆشی دەڵێ لەم ناوەیە
چەن‌ببینی جێ‌خۆشی سەد هێندەشی شاراوەیە
هەرچی شوێنی‌تر بچیت ئاوا بە گوڵ رازاوەیە
کۆزو مەڵبەندو هەوارگەی تۆیە کوردی هۆشیار

* * *

وەك بەهەشت وایە دیارە ئەم وڵاتی کوردی‌یە
ئەزیەت‌و جەورو جەفا رۆیشت‌و نۆبەی شادی‌یە
هەرکەسێ بەم جەژنە نامەنموونە زۆر نامەردی‌یە
ڕۆژی تیتاڵ‌و گەمەو گاڵتەوگەپ‌و لاقرتی‌یە
قەشمەری‌و بازی‌و یاری‌کەن بە عادی‌و نالەبار

* * *

خوایە بۆی ریك‌خەی بەباشی ئەم گەلەی والەم‌کەلە
بیگەیەنە شوێنی خۆی گەرچی دەزانی پەل‌پەلە
چاوەڕوانی لوتفی تۆیە جێ‌بەجێ‌ی‌کەی ئەم هەلە
پایەدارو بەرقەراربێت تیانەمێنێ وەلوەلە
هەر بەتۆ دەکرێ دەزانم چونکە تۆی پەروەردگار

* * *

بۆ خۆشی وێنەی نی‌یە ئەم نیشتمانە بێگومان
نایەوێت بیڵێم کە یەزدان کردیە سەرپشکی جیهان
داخی‌داخانم نەزانین‌بوو کەوا پشتی شکان
وا نەزانین‌بوو بە زانین جا لەمەولا کوردەکان
ئێوە نابینن وەهابێ چەشنی جاران کۆڵەوار

* * *

خوێندنی زۆرداری ئالاوە لەنێرومێ‌ی وڵات
وا بەزۆر پێ‌یان دەخوێنن لات‌و خاوەن دەستەڵات
ڕۆی سەری تیاچوو نەزانین‌بوو بەزانینی خەڵات
باش ئەژین ئەنجا هەموو لا ئەی عیراقی ڕۆژهەڵات
دوژمنی ئەم خاکە پاکە تێ‌ی کەوین سەر تا بە خوار

* * *

ڕێ‌مەدەن ناپاك‌و بەدکردارو پیس‌و بەدڕەوشت
جاری‌تر پیلان بگێرێ لێ‌بدەن وردو دروشت
بیدەنە بەرشەق سەراپا خائینانی زوڵ‌و پوشت
سەرنیگونی‌کەن نەمێنێ کردەوەو کرداری زوشت
هەرکەسێ بەدخووی وەتەن‌بوو بیکوژن زوو چەشنی (مار)

* * *

با لەخۆشی نیشتمان دەس‌کەین بەچەپڵەو هەڵهەلە
من هیوام وایە لەمەولا تیانەمێنێ عەرقەلە
پاڵی یەك‌بگرین سەراپا خزمەتی‌کەین ئەم گەلە
دوژمنانی ئەم عیراقە باش بخەینە زەلزەلە
چەن خۆشە پێکو بژین گشت لا هەموویێ قین‌و قار

* * *

یازدەی ئازاری حەفتا وا گەیشتە پانزە ساڵ
بون بەیەك کوردو عەرەب وا هەردوو لا چەشنی هەڤاڵ
بۆ ئەوانەی خائنن یا دوژمنن دەبنە زەواڵ
نایەڵن بەدخوو بمێنێ دوو گەلی خاوەن کەماڵ
چاپیکە (کاروان) تکایە شیعری (شوکری) خۆش وتار
بۆ نەوەی کوردی زرنگ‌و زیرەك‌و ئازاو بەکار

* * *

لە دەفتەری
بیرەوەری یەوە

## بیرەوەریم دەربارەی نەورۆز

# نەورۆز و هەڵوێست

کامیـــان

پیرەمێرد کە هەموو ساڵێ لە سلێمانی ئاهـەنگی نەورۆزی ئەگێڕا ، سلێمانی بە وردو درشتی‌یەوە ، ئەو رۆژە ، ئەڕژانە کارێزی وەشتا شەریف ـ دەشتایی بناری گردی مامەیارە ـ لە هەموو لایەکەوە ، چا ، دەم ئەکراو خواردن ئامادە ئەکرا ، لە بەیانی یـەوە تا دوای نیـوەڕۆ کۆڕی رمبـازی‌و هەڵپـەڕکێ‌و کەوشەك ئەگیرا ، لاوان ئەبەزینە ئەو دەشتە بەرینەوەو هەندێ ڕویـان ئەکـردە مامـەیارەو هـەندێکیش ئـەچوون بـۆ بینینی ئـەشکەوتـە دەستکـردەکـەی شێـخ مـەحمـوودی نـەمـر ، پیرەمێردیش کە ئەوە زیندوو کەرەوەو بـووژێنەوەی جـەژنی نەورۆز ، بەناو خەڵکەکەدا ئـەهاتو ئـەچوو ، دەمێ لەژێـر دەوارێکدا پشووی ئەداو دەمێکیش ئەچوو بەپیر میوانانەوە . لەچەند لایەکەوە یاپراخ لێ‌ئەنرا ، کە هەموو کەسێ بۆی هەبوو لەو یاپراخە بخوات ، چاپەزانیش چایان بەو خەڵکـە ئەداو ، هەندێ کەسیش برێشکەو نوقوڵیان ئەبەشی‌یەوە .

دوای نیوەڕۆ ، پیرەمێرد ئاهەنگەکەی دەست پێ‌ئەکرد ، بـەوەی دەستەیـەك شاگـردانی قوتـابی‌خانـە گۆرانی‌یـەکی نەورۆزیان پێشکەش ئەکرد ، پیرەمێرد خۆشی وتارێ ، یان ، هۆنراوەیەکی ئەخوێندەوە ، ئەمجا دوابەدوای ئەو شـاعیران هۆنراوەیان پێشکەش ئەکرد ، ناوبەناو قوتـایی‌یانیش جـۆرە یاری‌و وەرزەیەکی جوانیان ئەنواند .

پیرەمێردە باوکی نەورۆز ؛ بەڵام لە ساڵی ١٩٤٦دا ئێمە کە چەند لاوێکی چوست بووین ویستمان نەورۆز لە خاڵە (پیرەمێرد) بسێنینەوەو بۆ لەوەو دواش هەر خۆمان ، یان ئێمە مانان ئاهەنگی ئەو جەژنە بگێڕین ، مەبەستیشمان ئەوەبوو ، وەری‌گێڕین بەرەو رچەی ڕامیاری . ئەمجا لەو ساڵەدا کە ئەو بڕیارەماندا ، من‌و نووسەری کورد محەڕەم محەممەد ئەمین‌و سێ کەسی تر ، لە نامەخانەی گشتی کۆبووینەوەو نەخشەمان بۆ ئاهەنگی ئەوساڵە کێشاو بڕیارماندا ، لە ڕۆژی نەورۆزدا لە هۆڵی ئامادەیی کوڕان ئاهەنگەکە بگێڕین .. بێجگە لەم چەند کەسە ، گەلێ لاوی تریش بەشداری ڕاپەڕاندن‌و گێڕانی ئەو ئاهەنگە بوون . لەو سەردەمەدا هیچ سروودێ نەبوو دەربارەی نەورۆز ، ئێمەش نەمانویست گۆرانی‌یە سادەکانی نەورۆز پێکشەش بکەین ، لەبەر ئەوە ، بە وتەیەك ئاهەنگەکە دەست‌پێ‌کرا ، ئەمجا لەلایەن من‌و خوالێ‌خۆش‌بوو عومەر کەریم عەزیزەوە چەند تەرجیع بەندێکی (حەمدی) پێشکەش‌کرا .

ئەم ئاهەنگە ، یەکەم ئاهەنگە ، کە لاوان ئەیگێڕن‌و یەکەم ئاهەنگە کە کاڵای ڕامیاری‌ی ئەکرێ بە بەردا .

بەپێی بڕیاری خۆمان بەرگی کوردەواریمان بە ئاهەنگە کە پۆشی ، واتا ئەبوو هەرچی‌ی تیادا ئەکرێ شەقلی کوردەواریی پێوەبێ بەم ڕەنگە هەموو بەرگی کوردیمان پۆشی‌و ئەو خواردنانەش کە پێشکەش بە میوانان ئەکران خواردنی کوردەواری بوو کە بریتی بوو لە باسوق‌و سنجووق‌و برێشکەو مێوژ ، وە ئەم خواردنانەش لە سەبەتەی شووڵدا ئەگێڕران . وە هەروەها شەربەتی مێوژ بە جامولکە .

هەندێ لە شاعیران هۆنراوەیان پێشکەش کرد ، لەوانە (بێکەس‌و أ . ب . هەوری‌و بەختیار زێوەر) .

بەمجۆرە ئێمەی لاو لەو ساڵەدا ئاهەنگی نەورۆزمان لە باوکی نەورۆز سەندەوەو خستمانە ژێر دەستی خۆمانەوە ، بەڵام ئەو هەڵوێستەی بیرەوەریی ورووژاندو وای‌لێ‌کردم ئەم چەند دێڕە بنووسم هەڵوێستەکەی پیرەمێردە ، ئایا پیرەمێرد بەم هەڵوێست‌و کردارەی ئێمە ئەبێ چەند زویر بووبێ‌و ئەبێ چەند قینی لە ئێمەی لاوی خوێن‌گەرم هەستابێ ، پیرەمێردیش لەوێ‌بوو ، بانگ‌کرابوو هەروەك بانگ‌کراوان ، ڕەنگە یەکێکی تر بوایە لە جیاتی ئەو نەهاتایەو هەزاران تیری خەش‌و تەشەری تێ‌گرتینایە .

ئەمجا لە کۆتایی ئاهەنگەکەدا کە دەمەدەمی ئێوارە بوو وە سەدان مەشخەڵ ئامادە کرابوو بۆ نمایشێك ، پێشنیازکرا ، کە داوا لە پیرەمێرد بکرێ بە وتەیەك کۆتایی بە ئاهەنگەکە بێنێ .

**پیرەمێرد بانگ‌کرا « خاڵەگیان ، باوکی نەورۆز ، ئێمەی لاوی تازە پێ‌گەیشتوو ، ڕووی دەمی تکا ئەکەینە تۆی بەنرخ بفەرمووی بە وتەیەك کۆتایی بە ئاهەنگەکەت بێنی »**

پیرەمێردی دڵ نەرم هاتە شوێن دوان‌و دەستێکی گرت بە سێ‌بەندەیەوەو وتی : -

**« ئیستەش ئازاری زەبری تورکیا لە مووڕەغەی پشتما دێت‌و ئەچێ لەسەر ئێوەی کورد »**

**« پیرو کەنەفت بووم‌و ئێستە شەکەتم‌و لەش داهێزراوی هەورازە ڕێی هۆنراوەو ڕۆژنامەو نەورۆز بۆ ئێوەی کورد » .**

**« بەڵام ئەو فرمێسکانەی ئەڕژێنە سەر ڕووی پیرم فرمێسکی شادمانی‌یە چونکە من ئەترسام کە مردم مەشخەڵی نەورۆز بکوژێتەوە ، کەچی ئەو مەشخەڵە پیرۆزە ، سوپاس بۆخوا ، لە دەستی لەرزۆکی منەوە درایە دەست ئێوەی بازوو پۆڵا » ، « لەمنی پیرەوە پێشکەش کرا بە ئێوەی لاو » ، « چەند شادم بەوەی دڵنیابووم کەوا نەورۆزی جگەرگۆشەم دوای من بێ باوك‌و باوان نابێ » .**

پیرەمێرد کۆتایی بەمەی خوارەوە هێنا کە ئەڵێ :

**« بەسەر شاخی ئەراراتا بەلاوك پیرەمێرد سەرکەوت »**

**« ئەڵێ شوێنم کەون کوڕگەل ، شەوی سەکەوتنە ئەمشەو »**

بەم شێوەیە پیرەمێردی شاعیر هەڵوێستی دڵسۆزانەی خۆی نواندو کۆتایی ئاهەنگەکە هات بەوەی بە سەدان مەشخەڵی ئاگرەوە ڕژاینە ناو شەقامەکانەوە بۆ خۆپیشاندان ..

عبدالله بەرزنجی

# لەبیرەوەری رۆژی جەژنی نەورۆزدا

نەورۆز ئەو رۆژە پیرۆزەیە کە گەلەکەمان لە هەموو سالێکیدا ئاهەنگو زەماوەندی بۆ دەگێرێو ، ئەو رۆژە مێژووییەی بەرۆژی جەژنی نەتەوایەتی خۆی زانیوەو دەزاندرێتو بێ سێو دوو کوردیش وەك هەموو نەتەوەیەکی رووی ئەم جیهانە پانو بەرینە جەژنێکی نەتەوایەتی خۆی هەیە کە رۆژی جەژنی نەورۆزە .. پیرۆزیی رۆژی جەژنی نەورۆز جگەلەوەی کە جەژنی نەتەوایەتی گەلەکەمانە ئەو رۆژە پیرۆزە رۆژیکە لە کۆتایی پشووی زستانو یەکەم هەنگاوی یا با بلێین یەکەم رۆژی بەهاریشە ئەو رۆژە پیرۆزەیە کە سەرماو سۆلەی زستانی سامناك گلۆلەی لیژ دەبیتەوەو چی‌تر زەویو گوڵو گوڵزارو .. ئەزیەت نادات‌و ئەوانیش لە ژێر لەپی رزگار دەبن‌و بارە قورسەکەی سەرماو سۆلەو بەفر لادەچێ‌و تیشکی هەتاو لە جەستەیان دەدات ... جا ئەو رۆژە پیرۆزە کە ئێمەی کورد لە هەموو کوردستانی خۆشەویستدا ئاهەنگو زەماوەندی بۆ دەگێرین کە یەکەم جار وەك داستانەکەی کاوەی ئاسنگەرو سەرەن گلێ کردنی زوحاکی زۆردار کە زۆر جار بیستومانەو بۆمان گێردراوەتەوە لەلایەك ، هاتنی بەهاری خۆشی‌و شادی‌و نەمانی سەرماو سۆڵە .. هەردوکیان هەر سەرکەوتنی بەرەی خێرە بەسەر بەرەی شەردا .. کەواتە ئێمەی کورد تەنانەت جەژنەکەشمان هەر خێرو خۆشی‌و شادی‌یە ... جا بۆیە گەلەکەشمان دوواڕۆژی هەر خێرو خۆشی‌و ئاهەنگو زەماوەند دەبێت .. جا بەبیرەوەری زۆربەمان لە بیرمانە کە ئێمەی کورد ئەو جەژنەیەمان لێ قەدەغە کرابوو نەیان دەهێشت وەك پێویست یادی ئەو جەژنە پیرۆزەمان بکەینەوەو هەر رۆژەی لەلایەن دوژمنانی گەلەکەمانەوە کۆمەڵێك لۆمەیان دەخستە پاڵ ئەو رۆژە پیرۆزە .. لاوان‌و رۆشنبیرانی گەلەکەمانیش بەنهێنی یابەئاشکرا هەریادی ئەو رۆژە پیرۆزەیان دەکردەوەو شەوانی نەورۆز لەسەر لوتکەو جێگا بەرزەکانی ئاگرە گڕەکەی نەورۆزیان ئاگردەداو بڵێسەیان لێ‌هەڵدەستان ئەگەر لەژێر لولەی شەستیری دوژمنیشا بوایە بێ‌ئەوەی سڵ لە دوژمن بکەنەوە یادی ئەو جەژنە پیرۆزەیان هەردەکردەوە ..

هەر بۆیە لە ساڵی (1950) دا لە شاری سلێمانی کۆمەڵێك لەلاوان‌و خوێن گەرمانی ئەوشارە خۆیان ئامادەکردبو بۆ ئەوەی یادی رۆژی جەژنی نەورۆز بکەن‌و ئەو جەژنەیە بکەن بە جەژنێکی سیاسی چونکە پێشتر مامۆستای بەرزو نەمر خوا لێخۆشبو پیرەمێردی کورد خۆی هەموو ساڵێك وەك جەژنێکی فۆلکلۆری یادی ئەوروژەی دەکردەوەو مەنجەڵە دۆڵمەی دەبرد بۆگردی (مامەیارە) بەڵام ئەو ساڵەیان وەك وتمان لاوانیش بەشێوەیەکی ئاشکرا دەیان ویست روخسەت لە میری وەربگرن‌و جەژنەکەیان فرەوانتر بکەن .

برادەرێك بۆی گێڕامەوەو وتی کە ئێمە لەبەردەرکی سەرای سولێمانی بوین خۆمان ئامادە دەکرد بچین بۆ یادی رۆژی جەژنی نەورۆز پیرەمێرد لەولاوە خۆیو گۆچانەکەی هات بۆ ناومان‌و وتی دەی بەقوربانتان بم لاوان ... ئێمەش تێکرا وتمان خاڵە دەی هەر دەڵێی نەورۆز نەورۆز فەرمو شیعرێکمان بۆ بڵێو تائێمەش ... پیرەمێرد وتی راوەستن بابچم بۆ لای کاکە .. لەولاوە هاتەوەو قەڵەمەکەی دەرهێناو تەنانەت

پیرەمێردی ئەمر کاغزیشی پێ نەبوو پارچەیەک کاغزی لە زەوی هەڵگرتەوەو واش بزانم مقەبای پاکەت بوو .. دەستی کرد بە نوسین و دایە دەستمانەوە ... کە خوێندمانەوە تەماشادەکەین ئەو سرودە ئەمرەی (نەورۆزە)و دەڵێ : -

ئەمرۆژی ساڵێ تازەیە نەوزۆزە هاتەوە
جەژنێکی کۆنی کوردە بەخۆشی و بەهاتەوە

تادوایی ..

ئێمەش هەر لەوێ دامانە دەستی کاک صالح دیلان تا ئاوازی بۆ دابنێ و کاک قادر دیلانی براشی مۆسیقای بۆ داناو رۆژی دوایی نە یەکەم دەست پێکردنی ئاهەنگی نەورۆز بەو سرودە ئەمرە کرایەوەو کە تائێستاکەش ئەو سرودەو ئەو ئاوازو مۆسیقایەش هەر نەمرەو نامرێ و هەردەمێنێ و هەرتازەش دەبێتەوە ...

ساڵ بە ساڵیش سروودە نەمرەکەی پیرەمێردو نەورۆزە پیرەکەی گەلی کوردیش هەر لەگەڵ گوڵ و گوڵزارەکانی کوردستان نوێ دەبنەوەو بۆنو بەرامەتیان خۆشتر دەبێتەوە ..

بۆیە بە هیوای نەورۆزی ئەمساڵمان کە نەورۆزێک بێت لە هەموو نەورۆزەکانی ساڵانی پێشتر بەخۆشی و شادی و ئاسایشی گەلەکەمان یاد بکرێتەوەو کوردستانێکی ئاسایش و بەهاتز بێتەکایەوەو هەموو کۆنە دۆستو برادەرو هاورێیەک دەست لەناودەست بکەن و ئاگری نەوروز پێکەوە خۆشترو بلێسەدارتر بکەنەوەو دەست بە سنگرابوەستن بۆساڵێکی خۆشترو ئیتر یادی رۆژی چەژنی نەوروز لەهەموو لایەک پیروز بێت و پێکەوە چەژن بکەین ..

یادی سەربازە ون بووەکانی روژی جەژنی نەوروز فەراموش نەکەین و دەست بە سنگ و ریزیان لێ بنین و دەست نیشانی چاکەکانیان بکەین و ئەو ئەرکو ئازارانەی کە چەشتوویانە لە رێگای ناساندنی راستی رۆژی جەژنی نەوروز بە کۆمەلان و دانیشتوانی کوردستان و خزمەتی وشەی کوردی و کە ئێستا بوتە پردێکی پان و بەرین و لاوانی نەتەوەکەمان پیاتێ دەپەرن و بێ ئەوەی ساتمە بکەن و سەرەن گلێ بین ..

دووبارە جەژنی نەوروز لەهەموو لایەک پیروزبێت و پێکمانەوەبێت .

# نەورۆزنامەکەی

ئەو بیرەوەرییە کاریگەرانەی هەرگیز لە تەختی سینەو لۆچی بیروهۆشدا ناسرێتەوە .. ئەو لایەنانەن کە وەک بوویەکی زینەو بەرگی رەسەنایەتیان پۆشیوەو رۆڵی گرنگ لە پەرەپێدان و پێشکەوتنی کۆمەڵگای مرۆڤدا ئەبینن ، ئەو لایەنە گەش و بەجێیانە شایستەی پیرۆزبایی و لەبیرنەچوونەوەن .

سا ئەو لایەنانە لە چ بارودۆخێکدا سەریان هەڵدابێت ، یا لەهەر مەنزڵ و شوێنێکی ئەم دنیایەدا رووی دابێت هیچ جیاوازی نییە .

هەر بۆیە کارێکی ئاسایی و سروشتییە ؛ دیاردەو رووداوە گرنگەکانی ئەم دنیایە لە سەرەتادا تەنیا لە کونج و مەنزڵێکی ئەم سەرزەمینەدا رووبدات .. چونکە لەراستیدا کاری نوێ و داهێنەرانە هەر لە خۆوە سەرهەڵنادات و لە دایک نابێت بەڵکو بە سەختی لەگەڵ هەو بارودۆخی گونجاودا گرێدراوەو پێویستی بە زەمینەیەکی لە باری ئەوتۆ هەیە کە بەجۆرو شێوەیەکی سروشتی لە دایک بێت .

نەورۆزی کوردیش لە ئەنجامی کەنەوکوڵی ئەو جامی توورەییە هاتۆتە کایەوە کە سەختی سروشتی زستانی ناوچەکە قلبی کردوتەوەو دەستە چلکەی ستەمی زوهاک ئاگری تێبەردا .

من لەو واتەیە مەبەستم ئەوە نییە : بە تیروتەسەلی لە رووی مێژوویی و رامیارییەوە لە چۆنیەتی نەورۆزو راپەرینەکەی کاوە بدوێم و چەپکە تیشکی سەرنجێکی پێویستی ئاراستەبکەم .. بەڵکو تەنیا لە کلاو رۆژنەی دیاردە دەگمەنەکانی شاری سولەیمانییەوە گوڵی دەسکەنە کراوم بەیەخەی نەورۆزدا ئەکەم بەوەی چۆن لەو رۆژەی ئەم شارە دامەزراوە ، کەم و زۆر لە لایەن رۆشنبیرو ئەدیب و کەلە پیاوەکانییەوە هەوڵی بێوچان و تەقەلای بێ پایان لە پێناوی ژیانەوەو چەسپاندنی کەلتووری نەتەوەیماندا دراوە ، هەر لەبواری جەژنی نەورۆزدا [ شیعر هۆنراوەتەوەو ئاهەنگ سازکراوەو سەیران رێکخراوە .. ] . بە کورتی شار خرۆشاوە ، تاوای لێهات ئەم بوونە پیرۆزە مێژووییە لەسەرانسەری وڵاتدا بەم جۆرەی ئێستا چەسپاوە .

کەواتە ئەو تەقەلایە بەتەنگەوەهاتن و پاراستنی لایەنی

# مەلابرایم

عەبدوڵلا عەزیز خالد
سولەیمانی

کەلتوور سامانی نەتەوەیی و میژوویی کورد ئەگەینی

ئەوی بەدلنیاییەوە ڕاستی یەکی بێ گومانمان بۆ دەرئەخات ئەوەیە : لە سەرەتای چاخی بیستەوە نەورۆز وەك جەژنێکی خۆماڵی و نەتەوەیی ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ڕوخساری گەشترو ناوەرۆکی ڕەسەنتربووە

هەر زۆر لە دێرەوە لە شاری سولەیمانی ئێمەدا ئەو هەستە پیرۆزە لە سەرەتادا لە ناخی قولایی دەروونی نەوزاناو ڕۆشنبیرانەدا خرۆشا کە گوش و پەروەردەی زانیاری و زانستی ئاینی ئیسلام بوون ، ئەم ڕاستی یە بەڵگەیەکی زیندوە بۆ بەرپەچدنەوەی بەندوباوی بێ بنچینەی نەیار کە ئەوترا :

گوایە جەژنی نەورۆز ، جەژنی ئاگر پەرستانە !! .. دەستیان وتووە : « بەری تیشکی خۆر بە بێژنگ ناگیرێ » واقیع خۆی زامنی پوچ کردنەوەی هەموو قسەو قسەلۆکێکی بێ ڕەوایە .

دیارە یادکردنەوەی جەژنی نەورۆز لە لایەن مەلاو فەقێ ی مزگەوت و مامۆستاو قوتابی « حوجرکان » ەوە لە کاتی خۆیدا ئەو ڕاستی یەوە هەڵقولاوە : گەر نەورۆز ڕۆژو بۆنەیەکی تەواو تایبەت نەبێ بە نەتەوەی کوردەوە ، ئەوا بێ گومان خاوەنی بەشێکی سەرەکی یەتی .

ئەو تەقەلا دڵسۆزانەیەی لەم بوارەدا لەلایەن مامۆستای حوجرە « قوتابخانە ئاینی یە » کانەوە دراوە بۆ ژیانەوەو یادو بیرەوەری ڕۆژی نوێ ی ساڵ تازە ، بایەخێکی گرنگی هەیە بە تایبەت لە ڕووی ڕۆشنبیری و میژوویی یەوە ، بە نموونە ئەو دەست پێشکەری یە داهێنەرانەیەی لە ساڵانی جەنگی یەکەم و دوای جەنگ دراوە لە شوێنێکی وەك شاری سولەیمانیدا پێویستە بایەخێکی گەورەی پێبدرێ و هەروا سووك و ئاسان فەرامۆش نەکرێت و جێگای شیاوی خۆی لە ئەدەبی کوردیدا پێ ببڕێ .

لە ناو ڕۆشنبیرانی شاری سولەیمانیدا نەورۆزو جەژنی نەورۆز تەنیا بریتی نەبووە لە ئەدەبێکی ساتەوەختی و نووێراوێکی ڕووت ، بەڵکو ئەو ئەدەبە نووسراوەی سەبارەت بە جەژنی نەورۆز تۆمارکراوە ڕەنگانەوەی ڕاستی و واقیعی ڕۆژگاری سەردەمەکەی خۆی بووەو بەکردەوە هەنگاوی بونراوە .

بە نموونە پەنا ئەبەمە بەر [ نەورۆز نامە ] بە ناوبانگەکەی مەلابرایم ... ئەوەی لەم نەورۆزنامەیەدا وتراوە گێڕانەوەو وەبەرچاو خستنی شریتی سینەمای بیرورِاو هەڵوێستی ئەوساو سەردەمی خەڵکی شاری سولەیمانی یە بەرامبەر بە واتای نەورۆزو بەپیرەچوون و باوەش کردنەوە بۆی .

مەلابرایم ؛ خاوەنی « نەورۆزنامە » بەناوبانگەکەی ساڵی ١٩١٨ مەلایەکی ئاینی شارەزاو دڵسۆزبوو ، دەرامەتی ژیانی بەدەری وتنەوە بەدی ئەهێنا لە گەڕەکی دەرگەزێنی شاری سولەیمانی « حوجرەیەکی » هەبووە ، نووسین و خوێندنی ئاینی ی فێری قوتابیان ئەکرد .

مەلابرایم لە ساڵی ١٩١٨ دا نەورۆز نامەیەکی بە پێزو قەشەنگی هۆنیوەتەوەو بە شێوەیەکی وردو جوان و دروست دیمەنی ئەو سەردەمەی سەیران و ئاهەنگی نەورۆزی خەڵکی شاری سولەیمانیمان بۆ دەرئەخات .

ئەمەش چەند کۆپلەیەکی ئەو نەورۆز نامەیە ..کە هەر کۆپلەی دیمەنیکی دلڕفێنی ئەو سەردەمە ئەنوێنێ :

**نەوروزە ئەیامی فراغ**
**هات وەختی تەفریحی دەماغ**
**خۆش بوو چەم و گولزارو باغ**
**نەتبێ لە خەم وەك لالە داغ**

* * *

نەمروز نامەکەی مەلابرایم ناوەخنی نەورۆزمان بۆ ش ئەکاتەوە :

**نەمروز صاحب یەومون فەرە**
**جەننەت مثالە بەحرو بەرە**
**نەمروزە بوفەتح و ظەفەر**
**نەوروزە زۆر عوشرەف ئەسەر**

* * *

**نەوروزە بۆ صەق و صدفا**

نەوروزە بۆ میهرو وەفا
نەوروزە بۆ دەفعی جەفا
نەوروزە بۆ عەینی شیفا

● ● ●

مەلا برایم باری سەرنجی ڕۆشنبیری سەردەمێکی شاری سولەیمانی بەرامبەر نەوروز دەرئەبڕێ ئەوەتا زۆر هۆشمەندانە ئەو بۆنە مێژوویی یە بە سروشتەوە گرێ ئەدات :

ڕووی چلە شۆڕو شەڕی
بەفرو سەهۆڵی مەڕمەڕی
زستانو بای صەرصەڕی
گوێ ئاگرو داری تەڕی

● ● ●

دووکەڵ فرارو دەربەدەر
سەرما بە شوێنیا بێ ئەسەر
بەفریش کە بۆ سەرما سوپەر
ڕۆچوو لە داخا قوڕ بەسەر

● ● ●

غونچە لەسەر چڵ کۆمەڵە
بلبلی پەرکرد بەتەڵە
چەم پڕ لە پونگەو کووزەڵە
مر ، کەوتە هێلکەو جووجەڵە

● ● ●

لەو نەوروزنامەیەدا تابلۆیەکی ڕەنگینو جوانی سروشتی ژیانی ئەو سەردەمەی گوند نشینەکانی دەوروبەری شاری سولەیمانیمان نیشان ئەدات :

کاردوکنر واهاتە شار
پیشوکو شنگو هاودەستی یار
ترشوکە مزرو ئاوادر
بەندوکە پێشەنگی بەهار

دیارە ئەو دیمەنەی لەو نەوروزنامەیەدا خوی ئەنوێنی لە سەرەتای ساڵی تازەو تەڕی بەهاردایە .

ئاخو لەو کاتو دەمەی نەوروزنامەکەی تێدا نووسراوەتەوە خەڵکی شاری سولەیمانی چون چون پیشوازیان لە جەژنی نەوروزو تەڕی بەهارکردوە ؟

چمکێکی دی نەوروزنامەکە زور بەقولی ئەو لایەنەمان بو روشن ئەکاتەوە :

ئەمجا لە شوکرانەی ظەفەر
سەیران کەران بابچنە دەر
خەرج کەن دراوو سیموزەر
لێنین پلاو و گوشتی مەڕ

● ● ●

هەڵدەن گوڵی خێوەت لە دەشت
ڕەنگینە سەحرا وەك بەهەشت
شەکراو بدەن ئەوسا بەتەشت
چایی بگێڕن هەشت بەهەشت

● ● ●

چەم پڕ لە لالەو شەست پەڕە
سەحرا بە نێرگز ئەنوەرە
ڕۆژی سەفای سەیران کەرە
حەڵوای شەکر بێنەو وەرە

● ● ●

لۆرکەو فرو ، و میسکی عەبیر
ڕێکەوت لەگەڵ خورماو پەنیر
هاو بەزمی چایە ماستو شیر
قەیماغیش بو هەنگوین ئەسیر

● ● ●

چەند خوشە زوو وەختی سەحەر
سەف سەف قونابی بچنە دەر
سەڵتەو کەوای جوانیان لەبەر
خورماو پەنیریان هاوکەسەر

● ● ●

کارێزەکەی حاجی مەلا
بوی چووی کە نەختێ لابەلا
تا شەکرو چات مابێ لەلا
یاری کە بێ ترسو بەلا

چیرۆك
بۆ منداڵان

# ئالان و پاساری

**بکر باراوی سلێمانی**

هەموو بەیانی‌یەك زوو زوو پاساری‌یە دەنگ خۆشەکە ـەهاتە بەر پەنجەرەی ژووره بچکۆلانەکەی « ئالان » و ـەجریوە جریوێکی ناسك ئالانی لە خەو هەڵئەستان و رۆژ باشی ـۆئەکرد .

ـەر رۆژێکیش ئالان نەخۆش بوایە ، ئەو رۆژە چۆلەکە ـساری‌یەکە لەجاران زیاتر سەری لێ ئەداو دەهاتە لای ئالان : ـە دەنگە خۆشەکەی خۆی گۆرانی بۆ ئەووت و زەردەخەنەی ـەخستە سەر لێوە تەنکەکانی و ئازاری نەخۆشیەکەی کەم ـەکردەوە . زۆر جار ئالان لە خۆشی‌دا لە جێگاکەی دەهاتە ـەرەوەو بەرەو لای پەنجەرەکە ئەچوو . پاساریەکەش ـەبەردەمیا ئەکەوتە قوونە قوون و لە پەنجەرەکە دوور ـەدەکەوتەوە .

ـی لێهات ئالان و ئەو چۆلەکە پاساری‌یە بووبوون بە دوو ـاوری‌ی یەکتری . رۆژ لەدوای رۆژ یەکتریان زۆرتر خۆش ـەویست . تەنانەت شەوانیش ئەو دووانە بیری یەکتریان ـەکرد .

ـەوێکیان ئالان کەوتە بیرکردنەوە لە پاساری‌یە خۆشەویستەکەی و لە دڵی خۆی‌دا ووتی : ـ

بۆچی من ئەو پاساری‌یە جوانە نەگرم و لە ژوورەکەی خۆمدا ـاینەنێم !؟ شەوو رۆژ لە بەرچاوم بێت؟ خواردنی خۆشی ـدەمێ ، تا لێم دوور نەکەوێتەوەو ، زۆرتر گۆرانی خۆشم ـۆبلێ ؟ ئالان لە دڵی خۆیدا ئەو بڕیارەی‌دا . کاتێ بەیانی زوو ـاساریە جوانەکە هاتە بەر پەنجەرەی ژوورەکەی ئالان و ـۆژباشی لێکرد . ئالان پەنجەرەکەی کردەوە . پاساری بۆ ـاوەیەك هەڵفڕو دافڕی‌کردو لەبەر دەمیا نیشتەوە . ئالان پەلاماری‌داو لە نێوان هەردوو دەستە خرپنەکانی‌دا بەندی کرد ! تکای لە دایك و باوکی کرد تا قەفەزێکی خنجیلانەی بۆ بکڕن و پاساری‌یەکەی تیا بەندبکات . پاساری ئەمەی زۆر پێ سەیربوو . بیری لەو رۆژانە دەکردەوە کە تا خۆر ئاوا ، ئەم چڵ و ئەو چڵی درەختەکانی دەکرد . کام شوێن بەرز بوایە بە شەقەی باڵ خۆی ئەگەیاندێ . چۆلەکە پاساری وای لێهات ، رۆژ لە دوای رۆژ لاواز ئەبوو . گۆرانی‌یە خۆشەکانی لەبیر دەچووەوە! خواردنە خۆشەکانی ئالانی بۆ نەدەخورا ! ئالان ئەمەی زۆر پێ ناخۆش‌بوو . بە تایبە تی کاتێك ئالان نەخۆش کەوت و پاساری‌یەکە بەبێ دەنگی سەیری ئەکردو تێ‌ی ئەروانی . ئەنجام ، ئالان لەم کارەی خۆی پەشیمان بووە . بڕیاری دا کە پاساری‌یەکە ئازاد بکات ، تا وەك جاران بە دەنگە خۆشەکەی هەموو بەیانی‌یەك خەبەری بکاتەوەو گۆرانی بۆ بلێ ! بەیانی زوو ئالان پاساری‌یەکەی لە قەفەزەکە رزگارکرد . پاساری دای لەشەقەی باڵ و بەرەو بەرزایی ئاسمان و کێوەکان هەڵفڕی : لەو رۆژەوە پاساری بڕیاری دا کە هەرگیز نەگەرێتەوە بۆ لای ئالان و جارێکی‌تر خۆی لە منداڵان نزیك نەکاتەوە .

• •

# نان

**ژنڤیسینا : ڤۆلفگانگ بورشارت**
**وەرگێران ژئەلەمانی : عبدالواحدعبدالله**

بورشارت نڤیسەڤانەکێ ئەلەمانی‌یە ناڤ و دەنگیاوی بوی رەنگی چو بوو کو بەرهەمێت خو بێ نەخشاندین ژ هەژاری و نەخۆشی و بێزاریا هەمی خەلکی پشتی جەنگا جیهانێ یا دووێ . بورشارت ل سالا ١٩٢١ ل باژێرێ هامبۆرگ یێ هاتیە سەر دنیایێ ، پشتی خاندن بدیماهی ئینای ببو (پەرتووك

بەمەرجێ ئەو بەرهەمانە لەسەر بنچینەیەکی ڕاستو تەواو هاتبێتە کایەوە .. هەر بۆ ئەمەش پێویستە ڕۆشنبیرە پسپۆرەکانمان وریا بن کە ڕێگای پیلانو پەروەرشتو ڕاگەیاندن ئەبێ چۆن بێتو چۆن بەکاربهێنرێت بۆ گەیاندنی ئەو مەبەستەی کە دەیانەوێت بیهێننەدی ، ئەمەش بەمەبەستی ئەوەی توانای سستوچالاك بکەنەوەو فراوانی بەبواری کاری هونەری بدەن ئەوبوارانەی مەبەستە پێویستی بەتەقەلاو ڕەنجێکی زۆر هەیە

بەتاکو کۆمەڵ بۆ بەدی هێنانی ئامانجێکی بەسوود لەکەرتی گشتیو تایبەت تیادا بەشدار بێتو (مەسحی مەیدانی) داردەست بێ بۆ مۆسیقاو ئاوازە فۆلکوریو میللیەکان کەهێشتا زۆریمان چنگ نەکەوتوون ..( ئەوەی کەچنگیش کەوتووەزۆری تێك دراوە ) ئەم کارەش لێ بڕانێکی تەواوی دەوێ لەلایەن ئەو کەسانەوە کەپێی هەلئەستن ،بۆیەزۆر پێویستە ئەوکەسانە لەسەرەتاوە هونەری کلاسیکی بخوێنن لەقوتابخانەدا بۆئەوەی کادیری لێ هاتووی وایان لێپەیدا ببێ کەلەهەموو لایەنەکانی ئەم کارەبگەنو دواجار دەست بکەن بەکاری پراکتیکی . بۆ پێگەیاندنی کادری ئەم کارەلەناو کۆمەلی کوردەواریماندا و هەر کارێکی هونەری تریش بەتایبەتی ، پێویستەلەقوتابخانە هونەریەکاندا مامۆستای شارەزا لەمامۆستاکانی دەرەوەی وولات (لەوولاتەپێشکەوتووەکاندا) بهێنرێن هەتا وانەی هونەری بەقوتابیان بلێنەوەو کەلکیان لێ وەربگیرێت لەو لایەنەوە کەباسمان کرد بۆئەوەی لەجێگای کارەکە نزیکتربین .
بێگومان لەوپلەداکەئەو هونەرەئەخوێنرێتو قوتابیان بەژمارەیەکی باش دەردەچن لەژێر دەستی ئەوشارەزایانە ئەتوانرێت کەلك هەرلەو قوتابیانەلەچەند هەنگاوێکدا وەربگیرێتو کار بگرنەدەستو ئەستۆو ئەوجێگا هونەرییەچۆلانەی هەن پڕیبکەنەوە وەك مامۆستای مۆسیقا، یان مۆسیقاژەن یان دانەرێ یان گۆرانی بێژێکی هونەری ..هتد . ئەمانە هەمووی هەنگاوی باشن بۆ ئەوەی وەك سەرەتا بتوانین بزووتنەوەیەکی چاكو ڕۆشنبیری هونەری چاك بهێنینەدی . لەلایەکی تریشەوە بۆتەواو کردنی ئەم کارەگرنگە گەر ئەو



هونەرمەندە شارەزایی‌یەکی باشی پەیداکرد لەبارەی کۆمەڵەکەیەوە یان نەتەوەکەیەوەو لەگەڵ هەستو نەستی نەتەوایەتیدا ژیا ، ئەوا دەتوانێ ئەو پیلانانەی دەیگرێت ئەستۆی خۆی باش لەسەری بڕوات بۆ هێنانە دی ئەو مەبەستەی کەدەیەوێت بە جۆرێ چێژی ئەو مۆسیقایەی کەلەدەمو دەستی خۆیەوەو لەهەستی دەردەچێت دەنگ بداتەوە لەناو کۆمەڵەکەیو بەرەو پێشتری بەرێت .. ئەو مەبەستەش بۆئەوەی باش بێتە دیو جێ گیر بێت پێویستە :-

1 — هونەر مەند توانای خۆی دەست نیشان بکا لەهەموورووبەکەوەو بەپێی ئەو توانایەکار بکات کەتوانای بەسەرداشکێت بێ فێل لەخۆکردنو بەرەوپاشەڕۆژێکی ڕوونتر بڕوانێ .

2 — دەبێ هەستو دەروونی لەگەڵ هەستو دەروونی میللەتەکەیدا بژی ، بەتەواوی لەپلەی ژیانی میللەتەکەی بگات و هەستی لەگەڵیابێ ئەمەش ئەوەئەگەیەنێ کەپێویستە شارەزایی لەباری مێژووی نەتەوەکەی هەبێ .



ئەم دوو خاڵە گرنگە هونەرێکی باوەڕپێکراو دروست دەکات ، بەجۆرێ هونەرێکی بەستراو بەمیللەتەوەی لێ بوەشێتەوە . واتە چوونەناو هەست و دەروونی میللەت بۆ وەرگرتنی جەوهەری هونەری لەڕێی ژیانی کۆمەڵایەتی و رامیاری و زانستی و هەموو لایەنەکانی تریش شتێکی زۆر پێویستە ، چونکە دەتوانین دەست نیشانی پلەکانی ژیانی بکەین . لەسەر ئەو زانینەوە هونەرمەند هونەری خۆی بۆ پێشکەش بکا بەجۆرێ کار بکاتەسەر ئەو قۆناغەی کەتیائەژی و بیری تازە بخاتەوە .. بۆیەزۆر پێویستە کەهونەرمەند هەرچەندە شارەزابوو زیاتر بچێتە ناو کۆمەڵەکەیەوەو نابێ دوورە پەرێز لێ بوەستێت .. بەم چونەناو هەست و دەروونی کۆمەڵی یەوە ئەتوانێ ووردەووردە هەستی ئەو کۆمەڵەی لەگەڵ خۆی دا رابکێشێ و بەرەو ئەو مەبەستەپاکەی کەدەیەوێت بەرزی بکاتەوە بۆ پلەی پێشتر ، کار لەسەر کار ... بەرهەم لەسەر بەرهەم .. ئەمانە هەمووی (زامنن) بۆ ئەوەی پلەی هونەری و رۆشنبیری کۆمەڵ بەرزتربینەوەو چاک و خراپ لەیەك جیابکاتەوەو دەست نیشانی هونەری پێشکەوتووی خۆی بکات ، گەر کۆمەڵ بۆبەرهەمی هونەرمەندەکەی گوێی شل کردو بەهەموو هەست و دەروونیەوە لەگەڵیا ژیا ، ئەوا بەم جۆرە هەندێ را لەمێشکیا کەڵاڵە دەبێ بەرامبەر بەو بەرهەمە هونەریە .. ئایا مۆسیقابێ یان گۆرانی یان تێکەڵ ... ئەم رایەش دەردەبڕرێ بەهەر شێوەیەك بێ ئایا راستەوخۆ یا بەهۆیەکی ترەوە ، کاتێ ئەو هونەرمەندە ئەو رایانە دەکەوێتە بەر چاوو گوێی ، ئەمەوا لەهونەرمەند دەکات کەپەیوەندیەکی ( معنوی ) لەگەڵ کۆمەڵەکەی دا درووست بکا لەرێگەی ئەو رایانەوە کەدەر براون ، سەبارەت بەباشی و کەم و کورتی ئەوبەرهەمەی کەهونەرمەند پێشکەشی کردووە .

بەم جۆرە بەباشی تێ دەگا ئەو ئەرکەی پێی هەڵساوەو کردوویەتی تاچ رادەیەك کاریگەر بووە لەسەر ئەوانەی گوێیان لێ گرتووەو چۆن بۆئەو رایانە چوون .. بەم جۆرە هەستی هونەرمەند و کۆمەڵ تێکەڵ دەبن . لەیەکتردەگەن و هونەرمەند ئەنجامی مەبەستی لێ دیار دەبێ کەچەند کاری کردووەتە سەر کۆمەڵ و کۆمەڵیش لەپلەی هونەرمەندەکەی تێ دەگات ، ئەم هەستە پاڵ بەهونەرمەندەوە دەنێ کەبەرهەمی نایابترو چاکترو رەسەن و پێشکەوتوو پێشکەش بەکۆمەڵەکەی بکات و زیاتر تێکەڵاوی ببێ و بیرلەدوورکەوتنەوەی نەکا .. تێکەڵ بوونی هونەرمەند لەگەڵ کۆمەڵدا کار دەکاتە سەر پێشکەوتنی شارستانی ، هەر بۆیە ووتراوە ( گەر ویستت لەشارستانی هەر میللەتێك بگەی برۆ گوێ بۆهونەری مۆسیقا بگرە ) . پێویستە هونەرمەندی بەتوانا هەمیشە لەداهێنان ( أبداع ) دوانەکەوێ . هەمیشە بەرهەمی جوانترو نایابتر بهێنێتە کایەوە ، لەکاتێکاگەر پلەی هاوەڵەکانیشی لەتوانای خۆیدا نەبوون با رێنمایی یەدا هاوەڵەکانی بکا خۆ ئەگەر لەتوانای وەرگرتنی ئەو رێنمایی یەدا نەبوون با ئەو بەرهەمە بەنۆتە تۆمار بکات بۆ دوواڕۆژ ... ئەم پلەیەش کەئەو مۆسیقارە دەیگاتێ ئەنجامی قاڵ بوونیەتی چ لەهونەری کۆن چ لەهونەری هاوچەرخ وتازە ...بۆچوون بۆکاری مۆسیقاو گۆرانی لەکوردەواریماندا بۆچوونێکی ساکارە ، هەرچەندە کەرەسەیەکی میلۆدی یەکجار زۆرمان هەیە بەلام .. چۆن لەگەڵ ئەم کەرەسەیەدا کاردەکرێ ، ئەمەیان گرنگە، چونکە مۆسیقای کوردیمان چ لەڕووی

تەکنیکەوەو چلەڕووی شێوازەوە زیاتر پەنابردنە بۆ شێوە هونەری‌یە بیانیەکان . چ‌ئەوانەی نزیکن لێمان یان دوورن، بۆهێنانەدی‌و بەجێ هێنانی بەرهەمێکی هونەری، ئەم پەنا بردنەش دەگەڕێتەوە بۆنەبوونی کتێبخانەیەکی خۆماڵی هونەری کەوەك پێویست بتوانین پشتی پێ ببەستین‌و پەنای بۆبەرین لەکاتی پێویستدا، بەلام کەئەمەش‌وابوو، دەبێ ئەوکەڵك وەرگرتنەمان لەوسەرچاوە بیانیانە بۆمەبەستی خزمەت کردن‌و پەرەپێدانی ( هونەری نەتەوایەتیمان )بێت، چونکە لێرەدا ئەوەی کەزۆر ڕوونە لێمان ئەو بناغە زانستییە پراکتیکیەی کەلەمۆسیقا بیانیەکاندا هەیە لەلای ئێمە تەنانەت بەوەرگێراویش دەست ناکەون، جائەگەر ئەو جۆرە سەرچاوانەش دەست نەکەوتن، خۆنابێ لەبازنەیەکی داخراودا بخولێنەوەو تەنها بەهەرە ڕووتەکەمان بخەینەکار ..نەء..هونەرمەند پێویستە سەیرێکی ئاسۆیی (أفقی)و شاوڵی (عمودی). مۆسیقاوئاوازو گۆرانی میللەتەکەی خۆی‌و میللەتە دراوسێکانی‌و میللەتانی تر بکات‌و بەپێی ئەو قۆناغەی کەتیائەژی سوودیان لێ وەربگرێ .. کاتێ لەم باوەڕەوە دەستمان کرد بەکاری هونەری ئەوا ئەتوانین لەسەر بناغەیەکی ڕاست‌و زانستی‌وەك هەموومیللەتانی جیهان‌ئێمەش لایەنی (مۆرگەو قاڵب‌و شێوەو میلودی‌و هارمۆنی‌و ئیقاع‌و لێدان‌و قەوارەی تیپ‌و جۆری تیپی مۆسیقاوجۆری دەرهێنانی دەنگ‌و پەیژەی مۆسیقامان‌و مەقامەکانمان) دەست نیشان بکەین ..

تائێستا لەناو کۆمەڵی هونەرمەندانی

خۆمانداو تەنانەت هونەرمەندانی هەندێ نەتەوەی تر، گۆرانی‌بێژێك یان مۆسیقا ژەنێك کەتەنها بە بەهرەیەکی خوایی فێری کارە هونەریەکەی دەبێت، ئاوازێك دەهێنێ‌و تیپە مۆسیقایەکەش بەپێی توانای هونەری خۆی لێی دەدا بەو جۆرەی گۆرانی بێژدەیەوێت کەزۆرتر (سروشتی ) خۆیەتی‌و زانستی تیانیە ، بێ گومان ئەوبەرهەمە بێ‌هێزو کاڵ‌و کرچ دەبێ هەرچەندە لایەنی أیقاع یان میلۆدی شتێکی تیابەدی بکرێ ، بۆئەم مەبەستە دەبێ هەموو ئەورەگەزانەی ئاوازەکەی لێ‌پەیدا دەبێت‌ولێوەی دێتە بەرهەم بەشدار بێت وەك (میلۆدی،



ئیقاع هارمۆنی گەرپێویست‌بوو- شێوە ، دابەش‌کردن ، ئامادەکردن ڕادەی تیپە مۆسیقاکەو جۆری‌و پلەی زانستی ئەو مۆسیقاژەنانەو ووشەی هۆنراوەکەیی‌و دەرهێنانی مۆسیقاو ...هتد . واتەدەرکردنی ئاوازێك کارێکی هاری‌کاری‌یە لەبەینی کۆمەڵە هونەرمەندێکا هەریەکەیان بەپێی لێهاتوویی‌و شارەزایی خۆی.. بێ‌گومان گەر کاری هونەریمان لەسەر ئەم بناغەڕۆیشت ئەوا ئەتوانین هونەری مۆسیقامان بەرەوپێشەوە بەرین‌و پاشەڕۆژێکی ڕوونی بۆ بەدی بکەین ... بەپێچەوانەشەوە .

## ئەوسەرچاوانەی‌سوودم لێ‌وەرگرتوون


1 – مدخل الى الموسيقى العراقية ـ اسعدمحمد على .
2 – الفيلسوف‌وفن الموسيقى ـ جوليوس پورتنوری .ترجمة ـ د . فؤاد زكريا
3 – أصول‌الموسيقى ـ شارلس‌بێرس ترجمة ـ عبدالمنعم حسن على وعلى حسن على .
4 – الموسيقى العربية ـ سيمون جارجى ترجمة ـ عبدالله نعمان
5 – بعض مقالات من مجلة القيثارة ( خاصة بالموسيقى )

# کاروانی رۆشنبیری لە کوردستاندا

## لە هەولێر

دژوار : ئامادەی کردوە

### 1 — لیژنەی چالاکی سینەما

بیری دامەزراندنی یانەی سینەما لە بەڕێوەبەرایەتی رۆشنبیری جەماوەری دەگەڕێتەوە سالی 1979 بەلام لەبەر چەند هۆیەك دواخرا ..

ئەو ئارەزومەندانەی کە بە بەردی بناغەی ئەو پرۆژەیە دەژمێردرێن هەردەم بە خۆزگەی ئەو ئاواتە بون ، بۆیە لە سالانی 981 — 982 کە دەتوانین بە قۆناخی یەکەمی یانەکەی دابنێین .. چەند جارێك لە ژووری ڤیدیو کۆبونەوە بۆ بینین و هەلسەنگاندنی ئەو فلیمانەی خوارەوە لە رووی هێلی درامی ، مۆسیقا ، سیناریو ، دەرهێنان ..

**1 — عمر المختار دەرهێنانی مستەفا عەققاد**

**2 — تشرق الشمس بەرهەمی نوسەری بە ناوبانگی ئەمریکی هەمنگوای .**

**3 — انتخبوا الاستاذ سلیمان عبدالباسط ، دەرهێنانی مەحمەد عەبدولعەزیزو چەند فلیمێکی‌تر .**

قۆناخی دووەم ، کە لە سەرەتای سالی 1984 دەست پێ‌کرا بە پێی بەرنامەیەکی رێك‌وپێك کە لە لایەن بەرێزان جەودەت ئەحمەد ، شامل مەردان ، ناسر یوسف ، عەبدولغەنی یەحیا ، زوهیر عەبدولمەسیح ، رەجائی مەحمەدو چەندانی تر ئامادەو گفت‌وگۆی لەسەرکرا ، ئەو قۆناغەش کە تائێستا بەردەوامەو ئەو فلیمانەی خوارەوەی تیا نیشاندرا

**1 — اسکندریە لیە دەرهێنانی یوسف شاهین**

**2 — الافوکاتوی عادل ئیمام**

**3 — لیلەقبض علی فاطمة دەرهێنانی بەرەکات**

**4 — السلمندری ئیطالی**

دەربارەی چالاکی‌و هۆی دامەزراندنی یانەی سینەما ماموستا رەجائی مەحمەد کە ماجستێری لە رەخنەی هونەر هەیەو نامەکەشی بە نێوی (اعمال یوسف ادریس في السینما) یەو ئەندامێکی چالاکی یانەکەیە وتی : [ .. هونەری سینەما هونەرێکی زۆر گرنك‌و کاریگەرە چونکە سینەما هەموو جۆرە هونەرێك لە یەك فلیم کۆ دەکاتەوەو سەرەرای نزیك کردنەوەی هونەری کات‌و شوێن .. بەلام هونەرەکانی تر یان (کاتی) وەك مۆسیقاو شیعر ، یان هونەری (شوێن) وەك هونەری تەشکیلی .. ] دەربارەی ئومێدی دوا رۆژی یانەکە گوتی : [ خوایاربێ‌و بە یارمەتی ئەمینداریتی رۆشنبیری‌و لاوان نیشاندانی فلیمەکان دەکەینە هەفتەیی‌و لە هۆلی سینەما لەسەر ئامێری (35) م . م ، هەروەها بە ئومێدی ئەوەین ببین بە خاوەن

پەیڕەوو پرۆگرامێکی تایبەت .. دەربارەی مەرجی ئەندامانی یانە ، پێویستە شارەزایەکی لە نوسین ، رەخنە ، شانۆ ، سینەما ، مۆسیقا هەبێو خاوەن رەوشتێکی پاکبێ .. لە هەر جارێکدا ئەندامێکی لێهاتو هەڵدەبژێرین بۆ قسەکردنو بەڕێوەبردنی دەمەتەقێکەو نوسینەوەی پوختەی فلیمەکەو دابەشکردنی لەسەر ئەندامەکان بە بڵاوکراوەیەکی ناوخۆیی سێچوار لاپەڕەیی .. ] .

لە یەکەم دووشەممەی سەرەتای هەموو مانگێکو لە کاتژمێری (4) ی ، ئێوارە ژووری ڤیدیو بۆ ئەندامان والادەکری ، لە رۆژی 4/2/985 بۆ یەکەم جار بووم بە میوانی یانەکە ، لە دوای بەخێرهاتنی ئامادەبوان لە لایەن مامۆستا رەجائی مەحمەد هەڵسوڕێنەری گفتوگوی فلیمەکە .. مامۆستا پوختەیەکی فلیمەکەی بە بڵاوکراوەیەکی ناوخۆیی بەسەرمان دابەشکرد ..

(پەیمانی کۆن) فلیمێکی ئەمریکییەو سیناریۆی (کریستوفر فرای) و موسیقای (توشیرو مایوزومی) و دەرهێنانی (جون هیستون) بوو .

لە دوای بینینی فلیمەکە مشتو مڕێکی هونەریو مێژووییو فۆلکلوری لە لایەن ئامادەبوان لەسەرکرا بە تایبەت مامۆستایان .

**1 — جەودەت ئەحمەد ناجی . 2 — حسین رەشوانی .**
**3 — جلال خۆشناو 4 — دوکتۆر حیالی 5 — اسعد عدو .**

دوا بەدوای بینینو مشتومڕ ، کە ماوەی سێ سەعاتی خایاند بەڕێز جەودەت ئەحمەد جێگری ئەمینداریتی ناوەخۆییو کۆنترین ئەندامی یانەکە بەخێرهاتنی بەڕێز محمد محی الدین جێگری ئەمینداریتی رۆشنبیریو لاوانی کرد بە بۆنەی ئامادەبوونی .

شایانی باسە ژمارەیەکی زۆر لە رۆشنبیرانو ئارەزومەندانی هونەر لە هەردوو رەگەز بۆ یەکەم جار ئامادەبون .



## 2 — پیشانگای مەڵبەندی دەستکرد

لە رۆژی 9 — 12/2/985 لە هۆڵی قوتابخانەی ئەیوبیەی کچان ، مەڵبەندی دەستکردی (مرکز الاشغال اليدويه) سەر بە بەڕێوەبەرایەتی گشتی پەروەردە پیشانگایەکی جوانو رەنگینی بۆ بەرهەمەکانی مەڵبەند بە چاودێری مامۆستا باسل سابیر خۆشناو سازکرد .

مەڵبەندی دەستکردی هەولێر لە ساڵی 1979 بۆ یەکەم جار دەرگای بۆ فێرکردنو پێشخستنی مامۆستاکانی دەرزی هونەری والاکردەوە ، کە تا ئێستا (7) خول بۆ مامۆستایان کراوەتەوە سەرەڕای (5) پیشانگا .. مەڵبەندەکەش لەم بەشانە پێك هاتوە .

| بەشەکان | لێپرسراوو فێرکەرەکان |
| --- | --- |
| 1 — مافورو چنین | سامی حەسەن حەممۆ ، کەژاڵ قادر |





محەمەد سەعید

2 — وێنەو خۆش نووسی دارا محەمەد عەلی کامەلا ، ئەمیرە شەهاب مستەفا

3 — دارتاشی ئیسماعیل محەمەد ئەمین عەزیز

4 — سیرامیك عەبدولکەریم عەبدول رەحمان ، نەزار عەبدولهادی

5 — کانزا (مواد معدنیە) عەبدوللا جاسم محەمەد، هاشم عەلی جەرجیس



6 — پێستە سامال موسائەمین

7 — گوڵو گوڵزار نەورۆز عوسمان عەبدوللا

8 — دورین ئاواز شەفیق عەبدوللا

9 — کارەبا (سوتان) زەکی ئیبراهیم محەمەد عەلی

بەرهەمە سەرەکییەکان بە گشتی لەمانە پێکهاتبو (کاوەی ئاسنگەر بەخۆی و سەری ئەژدهاکەوە ، نالی شاعیر ، مایکل ئەنجلو ، داڤید ، تۆپی وەستا رەجەب ، دەستار ، کوتك ، بنەدار ، دارکەر ، کەوچك ، ماسی ، تاووس ، ئافرەت ، تەشی ڕێس منداڵ لە باوەشی دایکی ، منداڵێکی برسی ، کیفکە دەمانچە ، سواڵکەر ، قەڵای هەولێر ، تەکیە ، بووکمان هیناو هاتینەوە ، قوتابی کەونەگوند ، خێزانی جووتیار ..تاد) .

خەڵکەکە لەبەر دەرگاوە چاوی بەو تابلۆ جوانانە دەکەوت کە لێی نوسرابوو «بە هێزترین خۆشەویستی ، خۆشەویستی نیشتمانە » و « نێرگز بۆنی نەورۆزە ، پەیامی رۆژی پیرۆزە » و « خەنجەر لە کالان بێ ، ژەنگ دێنێت » ئەوەی شایانی باسە خەڵکێکی زۆر بۆ تەماشاکردن و کڕین هاتبوون .

## * پیشانگای وێنەی فۆتوگراف *

لە ڕۆژی 9 — 11 / 2 / 985 لە هۆڵی قوتابخانەی ئەیوبیەی کچان ، کۆمەڵەی وێنەگرانی ناوچەی کوردستان لقی هەولێر ، پیشانگایەکی خنجیلانەی بۆ کاك نەبیل خدر رەشید سازکرد .

پیشانگایەکە بریتی بوو لە چەندان وێنەی رەش و سپی و رەنگاورەنگ کە بە کامیرای هونەرمەندی ناوبراو وەرگیرابوو .. وێنەکان لە بارودۆخی ئەمڕۆ دەدوان وەك (ئافرەت ، ئاڵای عیراق ، منداڵێکی کوردی بێ تاوان ؛ شوێنەواری شاری هەولێر ، دەرگای ئەحمەدی قەلا ، تیپی تۆپی پێی هەولێر ، لە شوێنی دایکم ئیش دەکەم، لە گەڵ وێنەیەکی گەورەی خوالێخۆشبو حاجی خدر حاجی رەشیدی وێنەگرو پاڵەوانی

ماتۆرسكلی ساڵەكانی چلەكان وپەنجاكانی شاری هەولێر .

**نەبیل خدر رەشید**
- **لە ساڵی 1958 لە هەولێر لە دایكبوە**
- **دەرچووی ئامادەیی‌یە ، بەشی ویژە**
- **لە ساڵی 1970 مەستی هونەری وێنەگرتنە**
- **بەشداری چەندان پیشانگای بەغداو هەولێری كردوە**
- **بە خۆزگەی گەورەترین پیشانگایە بۆ وێنەكانی باوكی لە ساڵانی چلەكان .**

---

# لە سلێمانی

**« ئاسۆس » ئامادەی كردووە**

## 1 — چیرۆكی شانۆیي « دوای كڵاوی بابردوو كەوتوون »

مایەی خۆشبەختییە كە لە زۆربەی شارو شارۆچكەكانی كوردستانا لاوان « بەعەشقەوە بە بەرەوپیری ئەدەبو هونەرەوە دەچن » ، كۆڕی ئەدەبو شیعرو چیرۆكی شانۆیي بە هەول‌و تەقەلای لاوە خوێن‌گەرمەكان سازدەكرێن‌و پێشكەش بە جەماوەری دەكەن .

لە 1985/1/6 دا لە « چوارقورنە » ی سەر بە « ڕانیە » دەستەیەك لەو لاوە دڵسۆزانە چیرۆكی شانۆیی [ دوای كڵاوی بابردوو كەوتوون ] یان لە دەرهێنانی كاك « محمد مەلا ئەسعەد » پێشكەش‌كرد ، ئەوانەی بەشدارییان تێداكردبوو ئەم لاوانەبوون : بەكری عەبدوللا سوور ، موحەمەدی حاجی قادر ، عەبدول‌ڕەحمانی نەبی ، شیرین ئیبراهیم ، سەعدون موحەمەد بۆڵی « پیرۆزباییمان بۆ ئەم تیپە نوێیە ، بە هیواین بەردەوام‌بن لە سەر پێشكەش كردنی بەرهەمی چاكترو شوێنی خۆیان لە جیهانی هونەری كوردیدا بكەنەوە . جگە لەم تیپە تەمسیلی‌یە ، هەروەك كاك ئەحمەد بۆڵی لە ڕۆژنامەی [ هاوكاری ] دا بڵاوی كردبووەوە گوایا تیپێكی هونەری لە چوارقوڕنە بە یاریدەی تیپی هونەری ڕانیە پێك هاتوە ، وە ئەم تیپە بایەخ بە تەمسیل‌و گۆرانی و مۆسیقا دەدات ، چاوەڕوانی بەرهەمیانین لە گەڵ خواست‌و ئاواتمان بە سەركەوتنیان

**تێبینی : ئەم شانۆنامەیە نووسینی مامۆستا عەبدوللا میدیایە ، كاتی خۆی لە ژمارە دەی ساڵی یەكی گۆڤاری (بڵێسە) دا لە مانگی مایسی 1960 دا بڵاوكراوەتەوە**

## 2 — ئێوارە كۆڕێك دەربارەی « دۆخێكی نوێی شیعری كوردی »

سەر لە ئێوارەی ڕۆژی 10 / 1 / 1985 لە هۆڵی نەقابەكانی كرێكاران ، بەڕێوەبەرێتی ڕۆشنبیری جەماوەر لە سلێمانی كۆڕێكی بۆ نووسەری لاو كاك بەهات قەرەداخی‌و شاعیری لاو كاك محمد عمر عثمان سازكرد . سەرەتا شاعیر بۆ ئەوەی ئامادەبوان چێژ لە شیعرەكانی وەربگرن‌و بتوانن بە هۆیەوە بە ئاسانی بچنە ناو باسەكەی كاك بەهاتەوە شیعرێكی درێژی خۆی بە ناونیشانی [ لە غوربەتا ] خوێندەوە ، ئەمجا كاك بەهات باسێكی دەربارەی سەرجەمی شیعرەكانی ئەم شاعیرە لاوە بە ناونیشانی [ دۆخێكی نوێی شیعری كوردی نوێ ] پێشكەش‌كرد ، لە ڕوانگەو بۆچوونی خۆیەوە لە سەرجەمی تاقیكردنەوەو كەش‌و دۆخی شیعری محمد عمر عثمان دوا .
پێشەكی كاك بەهات باسی سەرهەڵدانی [ ڕوانگە ] ی كردو پەنجەی بۆ ئەو هەڵوێستانە ڕاكێشا كە بەرامبەری نوێنران ، ئەمجا باسی ئەنجامی ئەو دیاردەیەی‌كردو گوتی : « بڵقێكی گەورەی سەر ئاوبوو ، ئەوەندەی نەخایاند فش‌بووەوە » ، لە پاش ئەوە باسی ئەو شاعیرانەی‌كرد كە هەوڵیان دەدا بناغەیەكی نوێ بۆ شیعری نوێی كوردی داڕێژن ، بەڵام تادەهات كۆسپ دەخرایە ڕێگەیان !! لێرەدا ووتی : « زیاتر لە دە ساڵ



موته‌كه‌كانی شیعرو نووسینی كوردی بێ‌تام‌و بێ‌تین ده‌سه‌لاتی خۆیان سه‌پاندبوو به‌سه‌ر هه‌موو ڕێگه‌و ده‌روازه‌و بوارێكی بلاوكردنه‌وه‌و ڕاگه‌یاندنی جه‌ماوه‌ریدا » .

دوای ئه‌وه‌ی ڕووی گله‌یي كرده ئه‌وانه‌ی به‌ڕای خۆی - لێپرسراون له‌ پووكانه‌وه‌ی زه‌وقي خوێنه‌ری كورد ، ئه‌مجا ووتی : « واسه‌ر له‌ نوێ له‌م ساڵانه‌ی دواییدا شیعری نوێ‌ی كوردی به‌ بارو دۆخێكی تایبه‌ت‌و نوێدا ڕه‌ت ده‌بێت‌و ئه‌گه‌رچی هێشتا به‌ ته‌واوی گشت لایه‌ن‌و ڕوو دیوه‌كانی ڕوون‌و ئاشكرا نه‌بوه‌و نه‌بوٚته‌ ڕێبازو ڕه‌وتێكی سه‌ر به‌ خۆو دیار ، به‌لام ته‌قه‌لاكان دلسۆزییان پێوه‌ دیاره‌ »

ئه‌مجا هاته‌ سه‌ر جیهانی ئه‌م شاعیره‌ لاوه‌ له‌ پێشا باسی دوو لایه‌نی كرد : هونه‌ری‌و ده‌روونی ، كه‌ به‌ڕای خاوه‌ن باس ئه‌م دوولایه‌نه‌ له‌ حه‌فتاكانا پێ‌شێل كرابوون یاخود نه‌شاره‌زایانه‌ ده‌ستیان درابویه‌ . لێره‌وه‌ زۆرتر به‌ ناخی شاعیردا شۆڕبوه‌وه‌و كه‌وته‌ شي‌كردنه‌وه‌ی شیعره‌كانی ، پاییزو خه‌م‌و غوربه‌ت‌و قابیل‌و هابیل‌و دلی ڕه‌شپۆش‌وتا .. د. بایه‌خێكی زۆری به‌ پێوه‌ندی شاعیرو پاییزدا ، له‌ دواییدا هاته‌ سه‌ر « ترس » ، ترس له‌ مه‌رگێكی كاره‌ساتاوی‌و خوێناوی ، ترس كه‌ هێزێكی نادیارو وون‌و ئالۆز .

دوایي هاته‌ سه‌ر تاقیكردنه‌وه‌كانی شاعیر ، ئه‌مجا هه‌ست به‌ بێهوده‌یی ، لێره‌دا ووتی : « هه‌ستی بێهوده‌یی نه‌خۆشییه‌كه‌ تایبه‌ته‌ به‌و سه‌رده‌مه‌ مێژووییانه‌ی كه‌ كۆمه‌لی مرۆڤایه‌تی تێیدا ده‌گاته‌ ئاستی كۆتایی قۆناخێك‌و هێشتا ته‌واو سیمای داهاتووشی تیا به‌دی ناكرێ ، نه‌خۆشییه‌كه‌ تایبه‌ته‌ به‌و مرۆڤانه‌وه‌ كه‌ ووزه‌و خواست‌و توانایه‌كی خودیی زیاد له‌ خۆیاندا شك ده‌به‌ن بۆ به‌دی هێنانی گۆڕانكاری به‌ ئه‌نجام گه‌یاندنی كارێكی گران‌و مه‌زن » .

له‌ دواییدا هاته‌ سه‌ر سروشت‌و دونیای بیره‌وه‌ری ، ئه‌مجا كاك به‌هات ووتی : « محمد عمر عثمان شاعیرێكی ڕۆمانسی هاوچه‌رخه‌ یه‌كێكه‌ له‌و شاعیرانه‌ی سه‌ر به‌ جیلێكی ته‌واوی ئه‌مڕۆی كورده‌ ، ده‌توانین ناوی بنێین جیلی هه‌ره‌سی لوتكه‌ بلنده‌كان‌و تواندنه‌وه‌ی شێره‌ به‌فرینه‌كان‌و ئالۆزكانی ده‌نگ‌و كه‌ڕوو هه‌لهێنانی ڕه‌نگ‌و وون كردنی كێش‌و سه‌نگ !! » .

هه‌روه‌ها كاك به‌هات ووتی : « پێویستمان به‌ شۆڕبوونه‌وه‌ی ناوناخی شاعیرو هونه‌رمه‌نده‌ زیاتر له‌وه‌ی كه‌ خۆمان سه‌غله‌ت بكه‌ین‌و خه‌لكیش به‌ خۆمانه‌وه‌ خه‌ریك بكه‌ین به‌واوی پێشگرو واوی پاشگرو جل‌گرو چه‌ند شوێنێكی تركر !! » .

دوای ته‌واوبوونی باسه‌كه‌ی كاك به‌هات قه‌ره‌داخی چه‌ند برایه‌ك سه‌رنج‌و تێ‌بینی‌یان ده‌ربڕی له‌وانه‌ چیرۆكنووس مامۆستا محمد رشید فتاح ووتی : [ كاك به‌هات ڕه‌خنه‌گرێكی لاوه‌و ، خاوه‌ن بیرێكی پێشكه‌وتنخوازانه‌یه‌ ، بۆیه‌ له‌ مه‌یانی ڕه‌خنه‌و لێكۆلینه‌وه‌ی ئه‌ده‌بیماندا چاوه‌ڕوانی‌ی دواڕۆژێكی باشي لێ ده‌كرێت شاعیریش محمد عمر عثمان . شاعیرێكی نوێ‌یه‌و له‌ چاوی ئه‌و دوو سێ پارچه‌ شیعره‌یه‌وه‌ كه‌ له‌م دواییه‌دا له‌ گۆڤارو ڕۆژنامه‌ كوردییه‌كاندا بلاوی‌كردوونه‌ته‌وه‌ ، دیاره‌ شاعیره‌و خاوه‌نی هه‌ست‌و نه‌ستێكی ناسكی شاعیرییه‌ ]

ئه‌مجا كاك محمد رشید فتاح هاته‌وه‌ سه‌ر باسه‌كه‌ی كاك به‌هات‌و ووتی : « له‌ ڕووی هه‌ندێ بۆچوونی خاوه‌ن باسه‌وه‌ توندو تیژی‌و پێ له‌ سه‌ر داگرتنێكی وای تێدابوو كه‌ ڕاست‌و چه‌پ هێل به‌سه‌ر هه‌ندێ شتدا بهێنێ كه‌ له‌ ڕاستیدا وانین . پێشه‌كی ڕوانگه‌ وه‌ك دیارده‌یه‌كی ئه‌ده‌بی له‌ دایك‌بووی بارو زروفێكی ڕامیاری‌و كۆمه‌لایه‌تی‌بوو ، هه‌رچه‌نده‌ من له‌ ڕوانگه‌ییه‌كان نیم ، به‌لام نه‌ده‌بوو ڕه‌خنه‌گر به‌و جۆره‌ هێرش بكاته‌ سه‌ر ئه‌و دیارده‌ ئه‌ده‌بییه‌ . ڕاسته‌ هه‌ندێ له‌وانه‌ی كه‌ سه‌ر به‌و دیارده‌ ئه‌ده‌بییه‌بوون ، یان خۆیان پێیدا هه‌لواسی‌بوو !! له‌ ڕووی تێ‌نه‌گه‌یشتنه‌وه‌ ڕووی ڕوانگه‌یان

ژاكاندو ئالوزیان كرد ، بەلام ئەوانە وەكو بەفری بەهار توانەوەو ناویشیان نەما . رەخنەگریش دەبێ وەكو خاوەن بیرێكی پێشكەوتوخوازانە ئەوە لە بیرنەكات كە رابوردوو ئێستەو داهاتووش بە یەكەوە گرێ بدات » هەروەها مامۆستا محمد رشید لە دەربڕینی سەرنجەكانیا ووتی :

« رەخنەگر ، شاعیری بە شاعیرێكی رۆمانسی لە قەڵەمدا ، ئەمە وانییەو سەرجەمی شیعرەكانی محمد عمر دەرچووی قوتابخانەی رۆمانسیزم نین ، بەڵكو قوتابی قوتابخانەی ریالیزمیشیان تیایە . سەبارەت بە ووتەكانی كاك محمد عمر كە دەڵێ : شیعر بەلای منەوە تەنیا - جمالیات - ە ئەمەش راست نییەو شیعر بە تەنیا جمالیات نییە ... ئەگەر مەبەستی جمالیاتی شێوەو ناوەرۆك بێت ئەوا باشترە » هەروەها كاك محمد رشید فتاح داوای لە محمد عمری شاعیر كرد كە با تەعبیر لە ئازاری چینەكەی خۆی بكات و شیعر بۆ خواست و ویستی ئەوان بنووسێت ، گەر هەست بەو ئازارە بكات .

دیسان ووتی : « شوێن دەستی هەندێ لە شاعیرانی دی بە شیعرەكانیەوە دیارو ئاشكرایە وەك نالی ، هەردی ، رامبۆ .. تا .. د ، ئەمەش شتێكی ئاساییە كە لاوێكی وەك محمد عمر دووی ئەو شاعیرانە بكەوێ و كەڵكیان لێ ببینێ تاخۆی دەدۆزێتەوە » لە دوای ئەویش مامۆستا عبدالكریم حسن چەند سەرنجێكی خۆی پیشاندا لەوانە : ووتی .

1 - « من پێناسەیەك بۆ شیعرەكانی محمد عمر دادەبەزێنم وەك زاراوەی (سروشت دەروونی) .

ئەم بۆچوونەی كاك بەهات رەت دەكەمەوە ، چونكە پێویست بە دابەزینی زاراوە ناكات ، ئەوەی ئەو مەبەستی بوو لە دەروون شوناسیدا بە [ تداعی ] ناو دەبرێ كە شوێنێ باشتێ دەبێتە هۆی خولقاندنی بیرێك لای شاعیر .

2 - كاك بەهات ووتی : شیعرەكانی كاك محمد لە قوتابخانەی رۆمانسیزمە كە لەگەڵ ئەوەشدا بڕوای بە قوتابخانە ئەدەبییەكان نەبوو لە سەرەتای باسەكەیدا . بەڵكو بە سووكی دەزانی كە شیعر وەیان هەر بابەتێكی تری ئەدەبی بدرێتە پاڵ قوتابخانە ئەدەبییەكان لیرەدا كاك بەهات وەك



بڕوای خۆی دژی خۆی بووەوە .

3 - ئەوەی ئاشكرایە ، شیعرەكانی محمد عمر سەر بە قوتابخانەی رەمزین بۆ راستی مەبەست شاعیر خۆشی رەخنەی هەبوو لەوەی كە شیعرەكانی سەر بە قوتابخانەی رۆمانسیزم بن .

دەبێ ئەوە بڵێین كە ئیمرۆ ئەوەی لە شیعری كوردیدا دەبینرێ پڕ كراوەتەوە لە بیری كلاسیكی و رۆمانتیكی و رەمزی و ریالیزمی ، وە هەندێ لە شاعیرانمان هەموو ریبازەكانیان بە سەریەكدا تێك ترشاندوە ، وە بە ئاشكرا لە بیر یان ناوەرۆك . شێواز ، روخسار ، بە تێكەڵاوی لە كۆپلە شیعرەكانیاندا دەتوانرێ لە یەكتری جودا بكرێنەوە یان هەندێ جار شیعرە لایەنێك لەو لایەنانەی تێدا زاڵ دەبێ . ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ نەبوونی رۆشنبیری شیعری لای شاعیرانمان وە ئەوەی پەیڕەوی دەكات تەئسیراتی نالی و مەحوی و گۆران و شاعیرە نوێكانی ئەمرۆ یان بە ئاشكرا لە زەوقی شیعریان ئالاوەو ناتوانن لێی دەربازبن .

4 - رەخنەم لە شاعیر ئەوەبوو ، خۆی خاوەن سەلیقەیەكی باشە بەلام پێویستی بە [ ذهنی فلسفی ] هەیە . نموونەشم واتە بالاكەی ئەرستۆیە كە لە (هونەری شیعر) دا دەڵێ : بۆ شاعیر دوو بنچینەی سەرەكی پێویستە ، یەكەم سەلیقەی شیعر دووەم - زهنی فەلسەفی .

5 - سەرنجێكیشم بەرامبەر بۆچوونەكەی مامۆستا محمد رشید فتاح هەیە كە لە سەرەتای ووتەكانیا ووتی : شیعری گەورەو باش دەبێ دوای خوێندنەوەی موچركەیەكم پیا

بهێنی شتێکم لا بەجێ بهێڵێ . منبەش بە حاڵی خۆم لە گەڵ ئەم بۆچوونەدانیم ، چونکە شیعر زۆر مەزنەو پێناسەی بۆ دانانرێ ، (ئەراگۆن) دەڵێ : [ شیعـر تێروانـین نییە بـۆ جیهانێکی تر ، بەڵکو گۆڕینی ئەو جیهانەیە بۆ شیعر ] وە ئەمەش « إشراقە » یە بۆ شیعر نەك پێناسە .

6 — كاك بەهات دەربارەی هابیلو قابیل کـە تیشکی ڕووناکی بیری ڕەخنەی لە سەر کێشابوو ، نەیتوانیبوو بە تەواوی مەبەستەکە بپێکی ، بەڵکو وەك من بۆ ئاشکراکردنی ئـەو بیرە نوێیەی لەو کۆپلە شیعرەدا ڕوونم کردەوە لە کۆڕێکی شیعرا کە کاك محمد عمر خوێندیەوە ووتم : ئافەرین بۆ کاك محمد کە توانی یاسایەکی مـرۆڤایـەتی ئاشکـرا بکات وە ئەمەش لە شیعرا پێی دەوترێ « رؤیا » چونکـە دوای کوشتنی هابیـل بە دەستی قـابیل ئـەگەر وەك شـاعیر لە شیعرەکەیـدا دەڵێ : بۆچی کـوشتی ؟ بۆچی قـەلەڕەشی بۆنارد ؟ گومان لەوەدانییە وەك شاعیر مەبەستی بێ ئەگەر هەر کەسێك کەسێکی تر بکوژێ و بە پێی یاسای مرۆڤایەتی لە کوڵی بگرێو بیگێڕێ تا ئەویش دەمرێ ، کـەس کەسی نەدەکوشتو نرخی مردنیش وەها هەرزان نەدەبوو ، بەڵام کاك بەهات مەبەستە مرۆڤایەتییەکەی ئاشکرا نەکرد .

لە دوای ئەم تێبینیانەی مامۆستا عبدالكريم حسن لە لایـەن ئامادەبوانەوە کۆمەڵێ پرسیار ئاراستەی کاك بەهاتو کاك محمد عمر عثمان کراو ئەوانیش وەڵامیان دانەوە ، کۆڕەکە نزیکەی سێ سەعاتی خایاندو خەڵکێکی زۆر ئامادەبوون .

## 3 — چیرۆکی [ چارەنووسی ئادەمیزاد ]

کاتێك ئەم ژمارەیەی گۆڤاری [ کاروان ] دەگاتە دەست خـوێنەران ، دەبێ لە شـاری [ ڕانیە ] شـانـۆ نـامـەیـەکی بالاپێشکەش کـرابێ کە بـریتییە لە چیـرۆکی [ چارەنـووسی ئادەمیزاد ] نووسینی نووسەری سۆڤێتی بە ناوبانگ (میخائیل شولوخوف) گۆڕینی ئەورەحمانی حاجی مـارف ، دەرهێنانی هونەرمەند سیامەندی مامە . شیاوی باسە ئـەم کارە دوای شانۆ نامەی [ زیندانی ] کە لە ژمـارە (28) ی ئەم گـۆڤارەدا بـاسمان کـردبوو ، دووەم کـاری هـونـەری تیپی نـوانـدنی ڕانیـەیـە .. هیـوادارین لە بـواری هـونـەری کـوردیـدا سەرکەوتووبن .

## 4 — کۆبوونـەوەیەکی فـراوانی هونـەرمەنـدانی سلێمانی

ڕۆژی 20 / 1 / 1985 هونەرمەندانی کۆمەڵەی هونەرە جوانەکانو تیپی مـۆسیقای مـەولەویو تیپی مۆسیقـای سلێمانیو تیپی ســالارو تیپی شـانـۆی پێشـڕەوو تیپی نـوانـدنی سلێمانیو هونەرمەندە تەشکیلییەکان کۆبوونەوەیەکی فراوانیان لە گەڵ کاربەدەستانو لێپرسراوانا پێك هێنا ، لە پاش گفتوگۆو یەکالا کـردنـەوەی بـاری هـونـەری لە سلێمـانیـدا یـاداشتێکیـان پێشکەشکرد ، دەربارەی ئەو داخوازییانەی هونـەرمەنـدان تێکڕا لە سەری پێك هاتبوون ، واچاوەڕوان دەکرێ کە بەری تەقەلای ئەم ڕوو بە ڕوو بوونەوەیە بەم زوانە بێتە بەرو تیپە هونەرییەکان بکەونەوە چالاکیو پێشکەشکـردنی بەرهـەمی ڕەسەنی کوردی .

### « سەرنج »

تکا لە برا هونەرمەندو ڕوناکبیرەکانی قەزاو ناحیەکانی سەر بە پارێزگای سلێمانی دەکەین ، هەر جۆرە چالاکییـەکی هـونەری ، ڕۆشنبیـری ئەدەبی ، پێشکـەش دەکـەن ، وەك هەواڵێك لە چەند دێڕێکدا پوختەکەیمان بۆ بنووسنو لە گـەڵ وێنەی ئەو چالاکیەدا بەم ناونیشانەی خوارەوە بۆمان بنێرن ، تا لە کاروانی ڕۆشنبیری دوانەکەون ، پێشەکی سـوپاسیـان دەکەین .

**ناونیشان : سلێمانی ـ کتێبخانەی سلێمانی بە هۆی کاك عمر عبدالرحمن بە دەستی (ئاسۆس) بگات**

# لـه دهـوكـێ

ژ ئامادەكرنا : مەتین

## ئێڤارییەكا خاندنێن شیعری

ژ بزاڤێن رێڤەبەریا رۆشنبیری جەماوەر ل دهوكێ ، ب هەلكەفتنا جەژنا لەشكەرێ مە یێ پالەوان ، ل رۆژا 1985/1/9 ێ خاندنەكا شیعری هاتە سازكرن ، بو [7] هوزانڤانێن گەنج ، ل هولا رێڤەبەریێ .

هێژا رمضان عیسی‌و نزار محمد سعید ، پشكداری د پێشكێشكرنا ڤان هوزانڤانادا كرن .

دەرگەهێ ڤێ ئێڤاریا شیعری ژ لایێ ، كاك هزرڤـانێڤە هاتە ڤەكرن ، ب شیعرەكا درێژ . ل پێشەكییا شیعرا خـوە هزرڤان دبێژیت :

رۆژ هات بۆری ل ئەسمانێ ئێڤاری گری
چەند روندك ژ چاڤا هاتن .. خاترا خوە خواست ژ جیهانێ
بەلێ ل چۆنا خوە بوشمان بۆ دەما زڤڕی
هوزانڤانەك یێ قەلەندەر .. بێ خامەو پەرتوك‌و دەفتەر
كەت پەی رۆژێ .. كەت پەی دۆزێ
ئەی رۆژ وەرە دا نەفرین .. ئەی رۆژ وەرە بزڤڕین
ئەی رۆژ وەرە دا نەگرین .. ئەی رۆژ وەرە دا نەمرین
ئەز نا گریم كو دێ مرم .. ئەز نا گریم كو دێ فڕم
ئەز نا گریم كو یا دویرم .. چونكی دزانم
ئەگەر شەڤ چەندا درێژ بیت دێ زڤڕم
ئەز دگریم ژ بەر بەژنا بێرییا پەزی
مەقڕالێ شەڤێ شكاند هێشتا سۆبە سارو تەزی .

د دویڤدا هشیار محمد حسنی شیعرەكا دوانی خاند ، مە ئەڤ مالكە ژێ گرتن :

ڕابن ، دەستێت هەڤ بگرن
سەرێ جەلادا ببڕن
دەرفەتا شادییێ تەنگە
ل كاروانێ سەربەستییێ‌و
ل رێڤنكێت ئازادییێ
بو درەنگەو
هێشتا ل سەرانسەری
وەلاتێ من
جەنگە .. جەنگە
چ تۆڤ ڕەنگە ؟
چ تۆڤ ئەشكەنجەو ئاستەنگە
دیسا گەلۆ جەنگە جەنگە

پاشی دوستان ئامێدی هەلبەستەك خاند ل ژێر ناڤنیشانا «دایكا من مەهاباد» هو لێ دەست پێدكەت :

دایكا من مەهاباد
ئەز دزانم زاروكێت تە ژبەرو سینگێت‌تە د خەریبن
ئەز دزانم بێت بێ خەون چونكە شینا حەیرانوك‌و
لایێ لایێ دبەر لاندكێت وارا بێنە گوتن ...
ل دویماهیكێ دبێژیت :
بەلێ دایێ باوەر بكە كو ب ڤا ناپالاو تەیارا







کوندیت ته پی کاڤل نابن
ب گولله‌و تڤه‌نگێت نه‌یاری بێری‌و شڤان خلاس نابن
هندی ته دوو زاروك هه‌بن ته به‌روسینگ بو وا مابن
دێ ئه‌ڤ گونده بێت ئاڤابن بێت ئاڤابن .

**«رێدویر کورێمه‌ی» هه‌لبه‌سته‌کا جوان خاند**

بناڤ و نیشانا «لێ‌لێ دایێ» بێ‌قام ب دلێ حازراڤه نویسیا ، ژ به‌ر ئوب ده‌نگه‌کێ خوش‌و شرین خاند . ئه‌ڤ پارچا ژێری مه ژ هه‌لبه‌ستا وی هه‌لبژارت :

لێ لێ دایێ
کولێت دلێ من په‌نگییان
ئێش ئازارا به‌ردایێ
زێماری گوڤه‌ند گرێدا
بویمه ته‌پا به‌ر کاشوی
هه‌چیێ هات کاشو لێدا
ئیرو زه‌ری د خێلی ره‌شن
رێکا خوش مێرو عه‌گیدا
ستری‌و قرشن .. ستری‌و قرشن

**محمد هروری ژی هه‌لبه‌سته‌کا ژێ‌هاتی خاند ل دویماهیکا وی دبێژیت :**

سویند ب دارو به‌رو ئاڤا
سویند ب چه‌رخ و سال‌و گاڤا
سویند ب روژێ ل ده‌مێ ئاڤا
سویند ب پیرو جان‌و ساڤا
فه‌له‌ك زڤروکه یا تێتن
ب ئاوازڤه یا دبیتن






بکه‌ن گوڤه‌ند
بکه‌ن دیلان
بکه‌ن شاهی
دێ رابن رۆژا نێزیکه
وه‌لاتی بخه‌ملینن بویکه

**پاشی هوزانڤانێت گه‌نج حکمت اسماعیل‌و صدیق احمدی‌ژی هه‌لبه‌ستێت خوه خاندن‌و ئه‌ڤ ئێڤاری‌یا شیعری یا خۆش بدویماهیك هات .**

سوپاس بو رێڤه‌به‌ریا رۆشنبیری جه‌ماوه‌ر ل دهوکێ ، ل سه‌ر زه‌ڤه‌رو چالاکیێن پێ رادبیت ژبو لڤلڤینا بزاڤا رۆشنبیری ل پارێزگه‌هی . نه‌مازه ل سه‌ر درێژکرنا ده‌ستێ هاریکاریێ بو ڤان شاعیرێن گه‌نج ، ئێن تێهنی ژ بو چاڤ پێکه‌ڤتنه‌کێ ؛ ل گه‌ل جه‌ماوه‌ری شیعرێ . براستی ئه‌ڤ پێکوله‌نه ، بێ‌قام دباشن‌و دجهێ خوه‌دانه ، به‌لکو هولێ ئه‌م دێ شێین ، هنده‌ك داهێنه‌رو پێڤه‌هاتیا ژ ناڤ خورتو لاوێن دهوکێ ده‌رێخین داکو هاریکاری‌و بزڤینا وان ، بهێنه کرن ژ بو پاشه رۆژه‌کا گه‌ش ، ل سه‌ر رێکا خزمه‌تا شیعرا کوردی‌یا هه‌ڤچه‌رخ .

## لگه‌ل هوزانڤانه‌کێ گه‌نج‌و قه‌فته‌کا هوزانا

ل ئێڤاری‌یا چوارشه‌مبێ ، لرێکه‌فتی 6 — 2 — 1985 ژ چالاکیێت ئێکه‌تیا ئه‌دیب‌و نڤیسڤانێت کورد ـ تایێ دهوکێ . ئێڤاریه‌ك بو خاندنا شیعری هاته سازکرن ، بو هوزانڤانێ گه‌نجێ داهێنه‌ر « نه‌جیب بالایی » .

هێژا « حجی جعفر » هوزانڤانێ مه پێشکێش‌کر . کاك نه‌جیب‌ی هژماره‌کا هه‌لبه‌ستێت خو ، ژ مه‌را خـاندن ژوان : « گوندێت من هۆسا گوڤه‌ندا دگێرن » ، « کـاروانینه دایێ » « هـه‌ڤـرکـی » « ره‌نـگ‌و رونـاهـی » ، « خـه‌مـێـت شورشڤانه‌کی » ، « مروڤ‌و ئـاگرو خـوین » ، « میرم هـه‌لز



به‌یی » ، « سه‌رهاتیا چیایه‌حی ببد » .

ئه‌ڤه‌و پشتی خاندنا هه‌لبه‌ستا ، هژماره‌کا براده‌را که‌تنه قادا گینگه‌شێ ل گه‌ل هوزانڤانی ل سه‌ر ئامیرێت هونـه‌ری‌و وێنه‌و هزرو بیرێت د هه‌لبه‌ستێت وی‌دا هاتین . دیسـان ده‌رباره‌ی چـه‌ند پـه‌یڤه‌کـا ئاخڤتن چێبـو . ژ بـراده‌رێت پشکـداری د ئاخڤتنێ‌دا کرین ، کریم فندی ، فاضل عمر ، عبدالله جندی ، هشیار رێکانی ، نزار محمد سعید ، شڤان علی . ئو هۆسا ئه‌ڤ ئێڤاریا خـوش بکوتـایی هات ، ده‌مێ سـه‌عه‌ت‌و نیڤـا گه‌له‌ك براده‌را ژ حازرا های ژخو نه‌مان کو یێ ل سه‌ر پییا دراوستاینه ژبه‌ر خوشییا هه‌لبه‌ستاو خاندنا جوان‌و پێڤه‌هاتی یا هوزانڤانێ مه‌یێ زیره‌ك .

- **نجیب صالح بالایی**
- ل سالا 1962 یێ ل ده‌ڤه‌را به‌رواری‌بالا ل هه‌رێما دهـوکێ ژدایك بویه .
- ل سالا 1977 یێ ده‌ست بڤه‌هاندنا هوزانێ کریه
- هوزانێت خو د به‌لاڤوکێت کوردی‌دا به‌لاڤکرینه .
- نهو ژی قوتابیێ کولیجا په‌روه‌رده‌یی‌یه ل به‌غدا ـ سالا سیێ جوغراڤی .

# دیاریی ساڵی «١٩٨٤»یش چەپکە گوڵێکی ڕازاوەو هەمە ڕەنگ بوو

نووسینی : عەزیز حەریری

وێنەی : محمد بکر ابراهیم

وا ئەمساڵیش ئەمینداریێتی گشتی ڕۆشنبیریی و لاوانی ناوچەی کوردستانی خاوەن خودموختاری بەهەمان بێن‌درێژی و چوستی ساڵانی ڕابردوو هاتەوە مەیدان و ، لە ماوەی « 365 » ڕۆژدا توانی چەپکە گوڵێکی تری ڕازاوە پێشکەش خوێنەرانی کوردو کتێبخانەی کوردی بکات و کەلەبەرێکی دیکە پڕ بکاتەوەو ئازووقەیەکی چڕو پڕیش لە خۆراکی مێشك بۆ دڵسۆزانی ووشەی پیرۆزی کوردی بخاتە سەریەك ..

ئەوەتا ئەمساڵیش ئەم دەزگا ڕۆشنبیرییە بەو ماوە کورتەو ، بەو هەموو گیروگرفتەی چاپ و چاپخانەی ئیمڕۆ ، وەك کەمی کادیرو کارگەری پسپۆڕو شارەزاو دوورە دەستی ی چاپخانە لە شارەکانی کوردستان ، تەنانەت ئەرکی هاتووچوونیش ، کەچی ئەم دەزگایە خۆی بە شیاوی ئەوە زانی کە ئەو فرسەتە لە دەست خۆی نەداو ، دڵی نووسەرو ئەدیبانی کوردیش نەڕەنجێنێ و بەهەرچی چۆنێك بێت « 40 » کتێب و نامیلکەی کوردیی هەمەجۆر بخاتە بەردەستی بەشێکی زۆری خوێنەرانەوە ..

ئەمە وەنەبێ ئەنجامدانی ئەم ئەرکە کارێکی سووك و هاسان بووبێت ؛ بەڵکو تابڵێی پڕی‌بووە لە هیلاکی و ماندووبوون و شەونخونی ، بەلام هەردیسان خۆشەویستی ی ووشەی کوردی و خزمەتکردنی ئەدەب و ڕۆشنبیریی و پاراستنی کەلەپووری نەتەوەکەمان بونەتە مایەی هەوڵ و کۆششی بەردەوام و زیاتر بۆ وەبەرهەمهێنانی لاپەڕەیەکی زیدەتر لە دیوانێکی شیعر ، یا لە کتێبێکی چیرۆك ، وەیا لە کەشکۆڵێکی کەلەپووردا ، کە ئەمەیش بەش بەحاڵی خۆم وای دادەنێم ئەوپەڕی بە ئەمەگی و دڵسۆزی‌یە بۆ ووشەی کوردی ..

هەر لەم ڕوانگەیەشەوە پیرۆزبایی‌یەکی گەرم لەو برایانە دەکەم کە لە ئەنجامدانی ئەرکی ئەمساڵیاندا بەشداریان کردووەو بەردێکی دیکەیان خستۆتە سەر بناغەی بینا بەرزو پتەوەکەی ئەدەبی کوردیمان ..

هەڵبەتە ئەم کۆششەی ئەوانیش مایەی شانازی هەموو مرۆڤێکی دڵسۆزو بەوەفایە ، هەربۆیە بە هەلی دەزانم ئەمساڵیش ئاوڕێك لەو لایەنە بدەمەوەو بەپێ‌ی توانا لە هەریەکێ لەو بەرهەمانە بدوێم کە ئەنجامدراون ، جا چ ئەوانەی یارمەتی دراون ، وەیا ئەوانەی لە سەر ئەرکی ئەم ئەمینداریێتی‌یە بەچاپ گەیەندراون ، کورتەیەکی شێوە بیبلیۆگرافیانە لە بارەیانەوە بخەمە ڕووبۆ ئەوەی ئەرکی ئەو برا نووسەرو لێکۆڵەرەوانە تا ڕادەیەك هاسان بکەم گەر بیانەوێ ڕۆژێ لە ڕۆژان سوودی لێوەربگرن .. دووبارە بەو برایانە دەڵێم کە بەشداریان کردووە لە پێگەیاندنی ئەو چەپکە گوڵە ڕەنگینەدا ؛ دەستتان خۆش بۆ ئەو کۆشش و هەوڵەی داوتانە لەم بوارەدا ، پڕ بەدڵیش هیوای ئەوە دەخوازم کە ساڵی دادێ هەنگاوی گەورەتر بنرێت لە پێناوی بوژاندنەوەو خزمەتکردنی ئەدەبەکەماندا ..

ئێستایش فەرموون لەگەڵ ئەو بەرهەمانەی ئەمساڵ لەسەر ئەرکی ئەمینداریێتی لەچاپ دراون و ئەو بەرهەمانەی

...رمەتی نووسەرەکانیان دراوەو کەوتوونەتە کتێبخانەی کوردی‌یەوە ..

• یەکەم : ئەو بەرهەمانەی ئەمینداریتی چاپی کردوون ..

- ● ادب المقاومة الايراني : بە زمانی عەرەبی - د . نافع عقراوي .
- ● العالم الرباني ؛ الشيخ نورالدين البريفكاني : بە زمانی عەرەبی - وحيدالدين البريفكاني .
- ● ئەو شەقاقەت ژبیر ناکەم : د . نافع ئاکرەیی .
- ● فۆنەتیك : غازی فاتح وەیس .
- ● دیوانی ئەخۆڵ : ئەحمەد دەروێش عەبدوڵڵا .
- ● بەرهەمی خاوێن : علی عارف ئاغا .
- ● ڕێزمانی کوردی : و : دوکتۆر کوردستانی موکریانی .
- ● دیوانی بێبەش : مەلا مەسعود بێبەش .
- ● صدام حسين ؛ الزمان والمكان : بە زمانی عەرەبی - عبدالغفار الصائغ .
- ● دیلاکروا : و : محمد عارف سیامەنسووری .
- ● پەندی پێشینانو قسەی نەستەقی کوردی : د . شکریەڕەسووڵ .
- ● ئەوێ دبلۆماسی : و : صلاح سعدالله .
- ● ڕووبار : شێرکۆ بێکەس .
- ● دراسات كردية : بە زمانی عەرەبی : د . جمال رشيد احمد

● ادب المقاومة الايراني :

دوا بەدوای کردنەوەی چاپخانەی ڕۆشنبیریی ، کە سەر بە ئەمینداریتی گشتی‌ی ڕۆشنبیریی‌و لاوانی ناوچەی کوردستانە ، بەڕێوەبەرو کارگەرانی چاپخانەکە چالاکانە کەوتنە کارکردنو لە ماوەیەکی کەمداو بە شارەزایی‌یەکی کەمەوە توانییان کۆمەڵە بەرهەمێکی چاپ بخەنە بەردەست خوێنەران ، ئەمە جگە لە ئەنجامدانی گەلێ وورده ئیش‌وکاری دیکەیش بۆ دایەرەکانی ناوچەی کوردستان ؛ ئەوەتا هەر دوای چەند مانگێك ، یەکەمین بەرهەمی ئەو چاپخانەیە ڕووناکی دیتو کەوتە کتێبخانەکانەوە ، ئەویش کتێبی « أدب المقاومة الايراني » بوو کە برای نووسەرو دوکتۆر « نافع ئاکرەیی » ئامادەی کردووەو بەچاپی گەیاندووە .

ئەم کتێبە بریتی‌یە لە « 128 » لاپەڕەی قەبارە « 14,5 × 21 سم » و ، بە ژمارەی « 391 » ی سالی 1984 سپێرراوەتە کتێبخانەی نیشتمانی لە بەغداو ، نرخی « 500 » فلسە ..

نووسەر لە لاپەرە « 3 » ی کتێبەکەدا دەڵێ : « پێشکەشە بە « دایکی جووتیار » کە هاوڕێی سەفەرەکەم بوو بۆ فێربوونی زمانی فارسی » .. پاشان دێتە سەر پێناسەکردنی ئەدەبی بەرهەڵستکاریی ئێرانی‌و هەموو کێشەو گرفتەکانی‌و چەندەها نموونەی زیندوو لە شیعرو چیرۆکی ئەدیبو نووسەرە ناسراوەکانی ئێران دەخاتە ڕوو ..

لە ڕووی هونەریشەوە ؛ کاکە سەعید یەحیا نەخشەی بەرگەکەی کێشاوەو سەیدا « سرهند محمد سعدالله » سەرپەرشتی چاپو دەرهێنانی هونەریی کتێبەکەی کردووە ، ئەوەی شایانی باسە ئەم کتێبەی د . نافع بە زمانی عەرەبی نووسراوەتەوە ..

● العالم الرباني ؛ الشيخ نورالدين البريفكاني وآثاره ●

هەر لە چاپخانەی ڕۆشنبیریی لە هەولێرو ، لەسەر ئەرکی ئەمینداریتی گشتی‌ی ڕۆشنبیریی‌و لاوانی ناوچەی کوردستان ، کتێبی « العالم الرباني ؛ الشيخ نورالدين البريفكاني وآثاره » نووسینی « وحيد الدين قطب الدين نوری البريفكاني » دەرچووە .. ئەم کتێبە « 176 » لاپەڕەی قەبارە بەتاڵی « 23,5 × 16,5 سم » ەو ، بە زمانی عەرەبی نووسراوەتەوەو لایەنێکی فرەوانی لە ژیانو بەسەرهاتو نووسینەکانی شێخ نورالدینی بریفکانی گرتۆتە خۆو دیارییێکی بەکەڵکە بۆ کتێبخانەی کوردی .. ئەم کتێبە نرخی دینارێکەو لە کتێبخانەی نیشتمانی بەغدادا ژمارەی « 697 » ی ساڵی 1984 ی دراوەتێ .. نەخشەی بەرگو سەرپەرشتی‌ی چاپەکەیشی کاکە « سرهند محمد سعدالله » کردوویەتی .. نووسەر لە پێشەکی



کتێبەکەدا دەڵێ :

« وا ئەم پوختەیەی ژیانی ئەو موسلمانە مەزنە دەخەمە بەردەست خوێنەری ئازیز ، پەنا بەخوا گەر بوم کرا لە داهاتوودا دەستنووسەکانی بڵاو دەکەمەوە » ..

ئێمەیش لەگەڵ نووسەردا دەڵێین خۆزگە ئەم ئاواتە دەهاتە دی ..

*** ئەو شەڤا قەد ژبیر ناکەم ***

دیسان لە چاپخانەی ڕۆشنبیریی‌و ، هەر لە ساڵی 1984 دا ، دووەمین بەرهەمی برای نووسەر د . نافع ئاکرەیی چاپکراو بە کتێبخانەکانی ناوچەی کوردستاندا بڵاوبووە ، ئەم بەرهەمەی دوکتۆر نافع بریتی‌یە لە کۆمەڵە چیرۆکێك کە لە ساڵەکانی 1976 — 1982 دا ، نووسراونەتەوەو بەشێکیان لە گۆڤارو ڕۆژنامەکاندا بڵاوبوونەتەوە ، بەلام ئەمجارەیان لەنێو دوو توێی کتێبێکدا کۆکراونەتەوە ؛ « ئەو شەڤا قەد ژبیر ناکەم » کتێبێکی « 80 » لاپەڕەیی قەبارە بەتاڵی « 14,5 × 22,5 سم » میەو ، بە ژمارە (392) ی ساڵی 1984 سپێرراوەتە کتێبخانەی نیشتمانی لە بەغدا .. نرخەکەی 250 فلسەو کاك سرهند محمد سعدالله سەرپەرشتی لەچاپدانی کردووە ..

ئەوەی شایانی باسە کاك « دلاوەر جەلال غەریب » سەرجەمی چیرۆکەکانی بە خەتە جوان‌و نایابەکەی خۆی نووسیونەتەوەو هەر هەمان نووسینەوەیش وێنەی گیراوەتەوەو چاپکراوە .

نووسەر چیرۆکەکانی دەکاتە دیاری بۆ جووتیاری کوردی‌و دەڵێ :

« بۆ جووتیاری کورم کە زۆر جار پاڵەوانی ئەم چیرۆکانە بووە لەگەڵ خوشك‌و برایەکانی دا » .

**● فۆنەتیك ●**

لە زنجیرەی کتێبە زمانەوانی‌یەکان‌و لەسەر ئەرکی ئەمینداریتی‌ی گشتی‌ی ڕۆشنبیریی‌و لاوان ، کتێبی فۆنەتیك کە نووسینی مامۆستا « غازی فاتح وەیس » ە ، گۆشەیەکی دیکەی لە ئەرشیفی کتێبی کوردیدا پڕ کردوتەوەو شوێنێکی دیاری بۆخۆی هەڵبژاردوە ..

« فۆنەتیك » کتێبێکی « 128 » لاپەڕەی قەبارە (23,5 × 16,5 سم) ەو ، لە چاپخانەی « الادیب البغدادي » چاپکراوەو ، لە کتێبخانەی نیشتمانی‌ی بەغدادا ژمارە « 676 » ی ساڵی 1984 ی دراوەتێ‌و نرخی « 500 » فلسەو دوو هەزار دانەی لێ چاپکراوە ..

سەرپەرشتی چاپ‌و دەرهێنانی هونەریی‌و نەخشەی بەرگ‌و وێنەکانی ناوەوەی کتێبەکە عەزیز ڕەشید حەریری کردوونی .. مامۆستا غازی کتێبەکەی لە شەش بەشی سەرەکیدا کۆکردوتەوە ، جگە لە سەرچاوەو پێرست‌و ئەندێکس .. ئەم کارەی نووسەر هەوڵێکی پیرۆزە لە بواری زانستی‌ی زمانداو سەرچاوەیەکی بەکەڵکە بۆ دواڕۆژی زمانی کوردی ..

*** دیوانی ئەخۆڵ ***

مامۆستای شاعیر « ئەحمەد دەروێش عەبدوڵلا ئەخۆڵ » لە سەرەتای ساڵی ڕابردووا چەپکە هۆنراوەیەکی خۆی پێشکەش خوێنەرانی کورد کرد بە ناونیشانی « دیوانی ئەخۆڵ » ، ئەوەی شایانی باسە مامۆستا ئەخۆڵ هەر لە سەرەتای ژیانی‌یەوە لەگەڵ ووشەی کوردی‌و ڕۆژنامەو گۆڤارە کوردی‌یەکاندا ژیاوەو ئەوەی بۆی کرابێ کردوویەتی‌و دریغی‌ی نەکردووە ، بێگومان ئەم کۆمەڵە هۆنراوەیەیشی بەڵگەیەکی پتەوی قسەکەمانە ..

« دیوانی ئەخۆڵ » (128) لاپەڕەی قەبارە بەتاڵی (23,5 × 16,5 سم) ەو ، لە چاپخانەی « الادیب البغدادی » لە بەغدا (3000) دانەی لێ چاپکراوەو نرخەکەیشی « 500 » فلسە .



سەرپەرشتی ی چاپو دەرهێنانی هونەریی و نەخشەی بەرگ « عەزیز رەشید حەریری » کردوونی و بە ژمارەی « 831 » ی ساڵی 1984 سپێرراوەتە کتێبخانەی نیشتمانی لە بەغدا ..

ئەم دیوانەی مامۆستا « ئەخۆڵ » ی شاعیر کە خۆی پێشەکی یەکەی بۆ نووسیووە ، بریتی یە لە زیاتر لە سەد پارچە شیعرو چوارینەی شاعیر خۆی لەگەڵ شەش « پێنج خشتەکی » کە هەندێ لە شاعیران وەکو « ن ـ ناری ، رازی ، محمد عزیز ملا رحیم ، أ ـ ب ـ هەوری » لەسەر شیعرەکانی ئەو نووسیویانە .. هیوای تەمەن درێژی بۆ مامۆستا « ئەخۆڵ » و بەرهەمی بەپێزتر بۆ خوێنەران دەخوازین ..

**● بەرهەمی خاوێن ●**

بەرهەمی خاوێن ، دیوانە شیعرێکی دیکەی مامۆستای شاعیر « عەلی عارف ئاغا ـ شاری » یەو لەسەر ئەرکی ئەمینداریتی ی گشتی ی رۆشنبیریی و لاوانی ناوچەی کوردستان چاپکراوە ..

ئەم کتێبەیش هەردیسان لە چاپخانەی « الادیب البغدادی » لە بەغدا « 3000 » دانەی لێ چاپکراوەو نرخی « 600 » فلسەو « 166 » لاپەڕەی قەبارە بەتاڵی « 24 × 16,5 سم » ەو ، لە کتێبخانەی نیشتمانیی بەغدادا ژمارە « 67 » ی ساڵی « 1984 » ی دراوەتێ و کاک « سعید یەحیا » نەخشەی بەرگەکەی کێشاوەو کاک « جەعفەر بەرزنجی » ش ؛ سەرپەرشتی ی لەچاپدانی کردووە ..

مامۆستا « شاری » پێشەکی یەکی کورتی بۆ دیوانەکە نووسیوەو لە سەرەتادا دەڵێ :

« لە دیوانی ـ چەپکێ گوڵو غونچە ـ دا زۆر بە کورتی باسی ژیانی خۆم کردووە ، ئینجا بە پێویستم نەزانی لەم دیوانەشا ئەو باسە دووبارە بنووسمەوە » پاشان دەڵێ :

« ئەم دیوانە کە ناونراوە (بەرهەمی خاوێن) بریتیە لە پێنج برگە ..

- **برگەی یەکەم : بەشی نیشتمانیی و کۆمەلایەتی یە .**
- **برگەی دووهەم : بەشی دلداری یە .**
- **برگەی سێهەم : بەشی شینەنامەیە .**
- **برگەی چوارهەم : بەشی هەمەڕەنگەیە .**
- **برگەی پێنجەم : بەشی چوار خشتەکی یە .**

بەرهەمی خاوێن ؛ بەری رەنجی چەند ساڵەی ئەم شاعیرە خۆشەویستەمانەو هیوای تەمەنێکی درێژی بۆ دەخوازین ..

**● رێزمانی کوردی ●**

هەر لە بواری زمانەوانی یەوە چاپکراوێکی تریش کەوتە کتێبخانەکانەوە بە ناونیشانی « رێزمانی کوردی » ، ئەو کتێبە پرۆفیسۆر ک . ك . کوردۆییف دایناوەو دوکتۆر کوردستانی موکریانی بە کەرەستەی دیالێکتی ی کرمانجی و سۆرانی لە زمانی رووسیەوە وەری گێراوەتە سەر زمانی کوردی ، وەرگێر لە رووی دڵسۆزیی و وەفاداری یەوە ئەم کارەی خۆی پێشکەش کردووە بە رەوانی پاکی خوشکە جوانەمەرگ بووەکەی « شیرینی موکریانی » .. هەروەها پێشەکی یەکی خنجیلانەی بۆ نووسیوەتەوەو تیایدا دەڵێ :

« گرنگی ئەم رێزمانە لە جۆری بابەتەکەی دایە ، کە بۆ یەکەمین جار لە مێژووی کوردەلۆژی دا لەسەر بناخەیەکی زانستانە بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجی خواروو و کرمانجی ژووروودا لە زۆربەی هەرە زۆری بەشی فۆنۆلۆژی و مۆرفۆلۆژی زمانی کوردی دەکۆڵدرێتەوە » .

ئەم کارەی د . کوردستان جێگەی رێزلێگرتن و شانازی یە ..

ئەم کتێبە قەبارەکەی « 384 » لاپەڕەی قەبارە بەتاڵی « 23,5 × 16,5 سم » ەو لە چاپخانەی « الادیب البغدادی » لە بەغدا « 3000 » دانەی لێ چاپکراوەو نرخەکەیشی « 750 » فلسە .. وە بە ژمارەی « 731 » ی ساڵی 1984 بە کتێبخانەی



نیشتمانی ی بەغدا سپێردراوەو کاك جەعفەر بەرزنجیش سەرپەرشتی لەچاپدانی کردووە ..

وەرگێر لە کۆتایی بابەتە سەرەکی یەکانی کتێبەکە ناوی هەموو ئەو سەرچاوانەیشی دیاری کردووە کە لە دانانی کتێبەکەدا سوودیان لێوەگیراوەو ئەو بەرهەمە چاپکراوانەیشی نوسیون کە خۆی دایناون و بلاوی کردوونەتەوە هەر لە سالی « 1977 » ەوە تاکو سالی 1982 .

● هەندێ لە پێنج خشتەکی یەکانی بێ بەش ●

ئەم دیوانەیش بەشێکی ترە لە چاپکراوەکانی مامۆستا مەلا مەسعودی شاعیرە ، ئەم بەرهەمەی شاعیر کە بریتی یە لە کۆمەلە پێنج خشتەکی یەك لە چاپخانەی رۆشنبیریی لە هەولێر ، « 3000 » دانەی لێ چاپکراوە ، « 96 » لاپەرەی قەبارە (21,5 × 16سم) ەو نرخەکەیشی « 300 » فلسە ولە کتێبخانەی نیشتمانی ی بەغدا ژمارەی « 1057 » ی سالی 1984 ی دراوەتێ ، کاك « سەعید یەحیا » ی خۆشنووسیش بە جوانی سەرجەمی دیوانەکەی نووسیوەتەوەو سەرپەرشتی لەچاپدانی کردووە ، هەروەها نەخشەی بەرگەکەیشی کێشاوە ..

شاعیر دیوانەکەی پێشکەش دەکات بە گیانی پاکی « نالی و شێخ رەزاو هەموو کەلە رابەرانی شیعر .. کاك مەحموود زامداریش لەژێر سەردێری « وشەیەك » پێشەکی دیوانەکەی نووسیوەتەوەو لە سەرەتادا دەڵێ :

« بێ بەش وەك شاعیرێکی داشۆرین (هەجو) ناسراوەو لە دەرچووانی قوتابخانەی شێخی گەورەمان « شێخ رەزای تالەبانی یەو ـ من لام وایە ـ شاگردێکی چاکی رێبازی رەزایانەیە ، چ لە شیعرو چ لە باری سەرنجو چ لە هەلویست نواندناو تا رادەیەکی باشیش گرەوی ئەو هونەرەی بردوتەوە ..

● صدام حسين : الزمان والمكان ●

ئەم کتێبەیش چاپکراوێکی دیکەی ئەمینداریتی گشتی ی رۆشنبیریی و لاوانە ، سالی رابردوو بە زمانی عەرەبی دەرچووە ، ئەم چاپکراوە بریتی یە لە کۆمەلە بیرەوەری و نووسینێکی تایبەتی نووسەر « عبدالغفار الصائغ » کە لە دوو توێی کتێبێکی خنجیلانەدا پێشکەشی خوێنەرانی کردووە ..

ئەم چاپکراوە قەبارەکەی 168 لاپەرەی « 23,5 × 17 سم » ەوە ، نرخەکەی 500 فلسە ، لە چاپخانەی « الاديب البغدادي » دە هەزار دانەی لێ چاپکراوەو لە کتێبخانەی نیشتمانی بەغداش ژمارەی « 854 » ی سالی 1984 ی دراوەتێ .

ئەم کتێبە جگە لە پێشەکی یەکی کورت چوار بەشی سەرەکی گرتۆتەوە ، هونەرمەند رياض عبدالكريم نەخشەی بەرگەکەی کێشاوەو کاك جەعفەر بەرزنجیش سەرپەرشتی لەچاپدانی کردووە .

● دیلاکروا ●

لە بواری هونەرییشەوە ، مامۆستای هونەرمەندی ناسراو کاکە محمد عارف سیامەنسووری ، جارێکی تر بە شاکارێکی دیکەی هونەریی کتێبخانەی کوردیی بەسەر کردەوەو چاپکراوێکی جوان و خنجیلانەی خستە بەردەست خوێنەرانەوە کە ئەویش بریتی یە لە « 46 » نیگاری جۆراوجۆری هونەرمەندی جیهانی « یۆژێن دێلاکروا » کە دامەزرێنەری قوتابخانەی رۆمانتیکی لە هونەرداو یەکێکە لە زنجیرەی هونەرمەندە بلیمەتەکانی جیهان ، مامۆستای هونەرمەند سیامەنسووری ئەم کتێبەی لە زمانی رووسی یەوە وەرگێراوە ، وەرگێر بەم کارە مەزنەی توانیویەتی شتێ لەبارەی قوتابخانەی رۆمانتیکی یەوە بە زمانی کوردی بۆ هونەرمەندانی کورد بکاتە دیاری و پێشکەشیانی بکات ، جگە لەو تابلۆ نایابانەی نێو کتێبەکە ، لە لاپەرەکانی کۆتاییشدا کورتەیەکی ژیانی خۆی نووسیوەتەوە لەگەل تێکرای ئەو پیشانگا تایبەتی و گشتییانەی خۆی کە هەر لە سالی « 1961 » ەوە تاوەکو سالی 1981 کردوونیەتەوە ، چ لە دەرەوەی وولات و چ لە نێو وولاتدا ،

هەروەها ناوی ئەو بەرهەمو چاپکراوانەیشی نووسیوە کە تا ئێستا بەچاپی گەیاندوون .

ئەم کتێبە بریتی لە 76 لاپەرەی قەبارە « 28,5 × 21,5 سم »ەو ، نرخی دیناریکەو لە چاپخانەی « الاديب البغدادي » لە بەغدا سێ هەزار دانەی لێچاپکراوە ، لە کتێبخانەی نیشتمانی بەغداش ژمارەی « 1281 » ی سالی 1984 ی دراوەتێ ، کاک جەعفەر بەرزنجیش سەرپەرشتی لەچاپدانی کردووە .

ئەوەی شایانی باسە ، ئەم کتێبە بە کاغەزێکی نایابو بە چاپێکی جوانەوە پێشکەشی کتێبخانەی کوردی کراوەو هەردوو بەرگی یەکەمو دووەمی دەرەوەی کتێبەیش بە دوو تابلۆی جوانو رەنگاورەنگ رازێنراونەتەوە کە ئەمانەن .

بەرگی یەکەم : « ئازادی سەرۆکایەتی گەل دەکات ـ کە لە مۆزەخانەی لۆفر لە پاریس پارێزراوە » .

بەرگی دووەم : « گرێک لەسەر کەلاوەکانی میسولۆنگیدا ، کە لە مۆزەخانەی بۆردۆ پارێزراوە » .

سوپاس بۆ کاکە محمد عارفو ئەو کارە پیرۆزەی ، هیوادارین هەمیشە لەم بوارەدا بەرەو پێشەوە بچێتو سەرکەوێت ..

**● پەندی پێشینانو قسەی نەستەقی کوردی ●**

خوشکی ئازیزمان خاتوو شوکریە رەسوول لە سالانی زوو دەرفەتێکی باشی بۆ رەخساو لە ئەنجامیدا بەرەو یەکێتی شورەوی کەوتەرێ بۆ تەواوکردنی خوێندنی بالا « دکتۆرا » لەو وولاتەدا ، ئەوەبوو هەر لە سەرەتاوە بەشێکی گرینگی لە ئەدەبی میللەتەکەی هەلبژارد کە ئەویش « پەندی پێشینانو قسەی نەستەقی کوردی » بوو ، دوای هەولو کۆششێکی زیرەکانە توانی لە « 19 ی مایس سالی 1977 دا وەك کچە کوردێکی چالاك بەرگری لە کارەکەی بکاتو بروانامەی دکتۆرای لەسەر وەربگرێ . ئەم نامەی دکتۆرایەی خوشکی ئازیز دوای نزیکەی حەوت سال وا بە زمانی کوردی کەوتە کتێبخانەکانەوەو رووناکی بەخۆیەوە بینیو ئەویش وەکو هەر کتێبێکی دیکە کەلەبەرێکی گەورەی پر کردەوەو دیدەی خوێنەرانی پێ زاخاو درایەوە .

ئەم چاپکراوە بریتی یە لە « 154 » لاپەرەی قەبارەی بەتالی « 24,5 × 17 سم » و ، نرخەکەیشی 500 فلسەو لە چاپخانەی « الاديب البغدادي » لە بەغدا سێ هەزار دانەی لێچاپکراوە ، کاک جەعفەر بەرزنجی نەخشەی بەرگەکەی کێشاوەو « علي خورشيد » سەرپەرشتی لەچاپدانی کردووە ..

ئەم کتێبە کە دوکتۆر شوکریە رەسوولو کاك جەلال تەقی بە هاوبەشی لە زمانی رووسی یەوە گۆریویانەتە سەر زمانی کوردی ، لە سێ بەشی سەرەکی پێکهاتووە کە ئەمانەن :

**● بەشی یەکەم : مێژووی کۆکردنەوەو بلاوکردنەوەو لێکۆلینەوەی پەندی پێشینانو قسەی نەستەقی کوردی .**

**● بەشی دووەم : بەشەکانی پەندی پێشینانو قسەی نەستەقی کوردی .**

**● بەشی سێهەم : رەوانبێژیی زمانی پەندی پێشینانو قسەی نەستەقی کوردی .**

هەروەها ناوی ئەو سەرچاوە کوردیو عەرەبیو رووسی یانەیشی بردووە کە سوودی لێ وەرگرتوون ..

ئەم کتێبە لە کتێبخانەی بەغدا ژمارەی « 1280 » ی سالی 1984 ی دراوەتێ ..

**● ئەوی دپلۆماسی ●**

ئەم کتێبەش بە زمانی کوردیو بە شێوەی کرمانجی ژووروو ، لە کۆتایی سالی رابردوودا کەوتە کتێبخانەکانەوە ، وەرگێر بەم کارەی توانیویەتی بابەتێکی مێژوویی بەپێزو سوودبەخش پێشکەش خوێنەری کورد بکات .

ئەوێ دپلوماسی 736 لاپەرەی قەبارە بەتالی « 24,5 × 17 سم » ەو ، نرخی « 3 » دینارەو لە چاپخانەی « دار آفاق عربية » لە بەغدا سێ هەزار دانەی لێچاپکراوە ، لە کتێبخانەی نیشتمانی ی بەغدادا ژمارەی « 748 » ی سالی 1984 ی دراوەتێ .

دپلۆماسی ؛ لە نووسینی نووسەری ناسراو « جێمس ئولدرج » ەو ، بە زمانی ئینگلیزی نووسیویەتی یەوە ، مامۆستای هێژا سەیدا سەلاح سەعدوللا کردوویەتی بە




کوردی ، له لاپه‌ره دوودا وه‌رگێڕ ده‌قی ئه‌و نامه‌یه‌ی بلاوکردۆته‌وه که نووسه‌ر بۆی ناردووه‌و تیایدا خۆشحاڵی خۆی ده‌ربڕیووه به‌رامبه‌ر به وه‌رگێڕانی کتێبه‌که‌ی بۆ زمانی کوردی ، ئێمه‌یش پڕ به‌دڵ سوپاسی کاك سه‌لاح ده‌که‌ین‌و هیواداریین به‌رده‌وام بێت له‌سه‌ر ئه‌م کاره پیرۆزه‌ی ..

**● رووبار ●**

له به‌رگێکی قه‌شه‌نگ‌و به نووسینێکی ڕێك‌وپێك ، به‌رهه‌مێکی دیکه‌ی برای شاعیر کاکه شێرکۆ بێکه‌س که‌وته به‌رده‌ستی خوێنه‌ران ، که ئه‌ویش کۆمه‌ڵه چیرۆکه شیعرێکه له‌ژێر ناوی رووبار ..

رووبار ئه‌م چیرۆکه شیعریانه‌ی تیادا بلاوکراوه‌ته‌وه « شاعیرانی وولاته‌که‌م ، کوڕی زه‌ریا ، له ڕاکشانێکدا ، داستانی مامه‌یاره ، به‌یتی ئاگر ، داستانی به‌رده قاره‌مان » .. رووبار بریتی‌یه له « 184 » لاپه‌ره‌ی قه‌باره به‌تالی « 24 × 17 سم » و، له چاپخانه‌ی « علاء » له به‌غدادا سێ هه‌زار دانه‌ی لێ‌چاپکراوه‌و نرخی 750 فلسه ، له کتێبخانه‌ی نیشتمانی له به‌غدادا ژماره‌ی « 1416 » ی سالی 1984 ی دراوه‌تێ‌و کاك جه‌عفه‌ر به‌رزنجی سه‌رپه‌رشتی له‌چاپدانی کردووه ..

هونه‌رمه‌ند که‌مال هاوار خه‌تی به‌رگ‌و سه‌ردێرو تابلۆکانی نووسیوه‌ته‌وه‌و وێنه‌ی تابلۆکانی بۆ کێشاوه‌و هونه‌رمه‌ند « شێرکو عه‌زیز » یش هه‌موو چیرۆکه شیعریه‌کانی به خه‌ته خۆشه‌که‌ی نووسیوه‌ته‌وه ..

شاعیر له لاپه‌ره (182) دا ناوی ئه‌و بلاوکراوانه‌ی نووسیوه‌ته که تا ئێستا به چاپی گه‌یاندوون‌و ئه‌وه‌ی راگه‌یاندووه که به‌رهه‌می داهاتوویشی به ناوی « ڕه‌نگاله » ده‌بێت .. هه‌روه‌ها په‌راوێزێکی بۆ ئه‌و ووشه گرانانه داناوه که له‌نێو شیعره‌کاندا هاتوون .

**● دراسات كردية في بلاد سوبارتو ●**

ئه‌م کتێبه‌یش یه‌کێکه له‌و به‌رهه‌مانه‌ی سالی پار به زمانی عه‌ره‌بی چاپکراون .

ئه‌م چاپکراوه یه‌که‌مین به‌رهه‌می مامۆستای دوکتۆر « جمال ره‌شید » ه ، وه‌کو کتێب‌و به زمانی عه‌ره‌بی ده‌چێته نێو کتێبخانه‌ی کوردی‌یه‌وه‌و ، له بواری خۆیدا سوودێکی مێژوویی باشی لێ‌وه‌رده‌گیرێ‌و ده‌بێته سه‌رچاوه‌یه‌کی به‌که‌ڵك بۆ نووسه‌رو خوێنه‌ران .

قه‌باره‌ی کتێبه‌که « 194 » لاپه‌ره‌ی به‌تالی « 23,5 × 16,5 سم » ه‌و ، نرخه‌که‌ی 750 فلسه‌و له چاپخانه‌ی « دار آفاق عربية » له به‌غدادا سێ هه‌زار دانه‌ی لێ‌چاپکراوه ، کاك جه‌عفه‌ر به‌رزنجی سه‌رپه‌رشتی له‌چاپدانی کردووه ..

دووه‌م :

- **ئه‌و به‌رهه‌مانه‌ی یارمه‌تی نووسه‌ره‌کانیان دراوه ●**
- **کتابات ـ به زمانی عه‌ره‌بی ـ محي الدين زه‌نگه‌نه .**
- **راپه‌ڕینی نیکاراگوا ـ و : بورهان قانع .**
- **حسن زیره‌ك ـ میرزا که‌ریم**
- **شوان « چیرۆك » ـ عبدالله عزیز خالد .**
- **دیوانی ناری ـ کاکه‌ی فه‌للاح .**
- **نالی‌و زمانی ئه‌ده‌بی یه‌کگرتوو ـ که‌ریم شاره‌زا .**
- **به‌ره‌و فۆلکلۆر ـ خالد جوتیار**
- **وون‌بوون ـ که‌مال سه‌عدی .**
- **چیروکه‌کانی مه‌م ـ محمد مولود « مه‌م » .**
- **دیدارێکی دوور « چیرۆك » ـ ره‌زا گوڵ جه‌لال .**
- **رێوی گه‌رمیان‌و کوێستان « فولکلۆر » عمر ابراهیم عزیز .**
- **فۆلکلۆری کوردی له ناوچه‌ی دزه‌ییاندا ـ ئاواز ئه‌حمه‌د .**
- **دلیل تنسیق الزهور ـ به زمانی عه‌ره‌بی ـ د . طاهر نجم .**

● بۆمە گوتن ـ « چەند چیرۆك » ـ خالد حسین .
● دیوانی لوتفی « شیعر » ـ شێخ لطیف برزنجي
● چرۆ « شیعر » ـ گوشاد حەمە سەعید .
● گەشەی مندال « دەروونزانی » ـ جلال خلف.
● کۆمەڵە شیعری مەلا عەباس حیلمی کاکەیی « شیعر » ـ هەردەوێل کاکەیی .
● سێ تراژیدی ـ و . عەزیز گەردی .
● رەشپۆشێکی جیهانی چوارەم « چیرۆك » ـ مصطفی صالح کریم .
● هەڵبژاردە لە داب و نەریتی گەلان ـ محمد بەدری .
● مێژووی کۆیە ـ بەرگی دووەم ـ طاهر حویزی .
● باشترین دیاری « ئایینی » ـ شێخ محمد بالیسانی .
● ئۆلدوزو بووکە شووشەی قسەکەر « چیرۆك بۆ مندالان » ـ غەریب پشدەری .
● دەروازەی دراما بەشی دووەم ـ ئەحمەد سالار .
● لیرەیەك لە گەنجینەی نەتەوەی کورد ـ ئەسعەد عەدۆ .

## ● یارمەتیدانی « 26 » نووسەر لە سالی « 1984 » دا ●

ئەوەی زیاتر سەرنج رادەکێشێ لە بواری یارمەتیدانی نووسەرو ئەدیبانەوە ، ئەوەیە سالی پار توانرا « 26 » کتێب و نامیلکەی هەمەجۆر بە زمانی کوردی و عەرەبی ئەنجام بدریٰ و بە شێوەیەکی چاك یارمەتی ئەو کۆمەڵە نووسەرە بدریٰ و ماوەی ئەوەیان بۆ برەخسێ بەرهەمەکانیان بەچاپ بگەیەنن ، یەکەمین کتێبیش کە سالی پار کەوتە بازارەوە « کتابات » ەکەی کاك محي الدین زەنگەنە بوو کە ئێستا لێرەدا ناوی دەبەین .

● کتابات ●

ئەم کتێبەی کاك محي الدین زەنگەنە بە زمانی عەرەبی نووسراوەتەوەو بریتی یە لە کۆمەڵە کورتە چیرۆکێك کە لە نێوان سالانی 968 تا 975 دا نووسراونەتەوەو لە دووتوێی بەرگێکی خنجیلانەدا کۆکراونەتەوە .

کاکە زەنگەنە ماوەیەکی زۆرە شەونخوونی لەگەل نووسین و نووسینکاری دەکێشێ و توانیویەتی کۆمەڵە بەرهەمێکی چاك و بەپێز پێشکەش بە خوێنەران و بینەرانی شانۆ بکات .. تەنانەت هەندێ لە شانۆگەری یەکانیشی پەریونەتەوە دەرەوەی سنووری وولاتیش ..

نووسەر کۆمەڵە بەرهەمێکی چاپکراویشی هەیە جگە لەو نووسینانەی کە لە گۆڤارەکاندا بلاوی کردوونەتەوەو کراون بە کوردی و ، چەندین پاداشتی لەسەر دەقە شانۆگەریەکان پێ بەخشراوە . ئەم برایەمان بە نووسەرێکی لێهاتووو ناسراو دەدرێتە قەلەم ، دوا بەرهەمیشی کتێبی « کتابات » ە ، کە بە یارمەتی ئەمینداریتی گشتی ی رۆشنبیری و لاوان لەچاپدراوەو دەمێکە کەوتۆتە کتێبخانەکانەوە ..

ئەم کتێبە بریتی یە لە « 112 » لاپەرەی قەبارە بەتالی (23 × 16 سم) ەو ، لە چاپخانەو ئۆفسێتی (عشتار) سێ هەزار دانەی لێ چاپکراوەو نرخەکەیشی (750) فلسە ، هونەرمەند ریاض عبدالکریم نەخشی بەرگەکەی بۆ کردووەو لە کتێبخانەی نیشتمانی ی لە بەغدادا ژمارەی « 93 » ی سالی 1984 ی دراوەتێ ..

ئەوەی شایانی باسە ئەم کتێبە لە رێگەی کتێبخانەی جیهانی یەوە دابەش کراوەو بلاوکراوەتەوە .

## ● راپەرینی نیکاراگوا ●

لە بەرگێکی قەشەنگ و بە چاپێکی جوان و رێك و پێك کاك بورهان قانع دیاری یەکی خنجیلانەی پێشکەش بە کتێبخانەی کوردی کرد کە ئەویش « راپەرینی نیکاراگوایە » لە سالی 1956 — 1979 ، بریتی یە لە مەسەلە بنچینەییەکانی شۆرشی خەڵکی نیکاراگوا ..

لە پێشەکی کتێبەکەدا کاك بورهان دەلێ :

« بۆ ئەوەی کتێبخانەی کوردی لەو زێرە ئەدەبی یە بێبەش نەبێت و خوێنەری کورد لە راپەرینە یەك لەدوای یەکەکانی گەلی نیکاراگوا تێبگات ، ئەم کتێبەم کرد بە کوردی .. وەپێم وایە کارێکی خراپم نەکردبێ » .

لە لاپەرەی دووەمیشدا دەلێ :




« پێشکەشە بەو کەسانەی : بەبێ چاوەڕوانی پاداشت ، لە پێناوی گەلدا ڕائەپەڕن .. » .

وەرگێڕ بۆ ئەنجامدانی ئەم کارەی سوودی لە کۆمەڵێك سەرچاوەی بیانی وەرگرتووەو هەندێکیانی لێ دەستنیشان کردوون .

ڕاپەڕینی نیکاراگوا بریتییە لە 160 لاپەڕەی قەبارە بەتاڵی « 23.5 × 16.5 سم » ەو ، لە چاپخانەی « الحوادث » لە بەغدادا سێ هەزار دانەی لێ چاپکراوەو نرخەکەی 750 فلسە ، لە کتێبخانەی نیشتمانیی لە بەغدادا ژمارە « 619 » ی ساڵی 1984 ی دراوەتێ ..

ئەم کتێبە لە زمانی فارسییەوە وەرگێڕدراوەو شەش بەشی سەرەکی گرتوەتەوەو بابەتێکی مێژوویی بە پێزو دەوڵەمەندە .. .

## ● حەسەن زیرەك ●

کتێبێکی قەبارە بەتاڵی « 128 » لاپەڕەی « 23,5 × 16.5 سم » ەو ، نرخی 850 فلسە ، لە چاپخانەی حسام لە بەغدادا لە چاپدراوەو لە کتێبخانەی نیشتمانیی بەغداش ژمارە « 908 » ی ساڵی 1984 ی دراوەتێ ..

ئەم کتێبە کە کاك میرزا کەریم خۆشناو نووسیویەتیو بەچاپی گەیاندووە ، بریتییە لە کورتە باسێکی مێژووی ژیانی هونەرمەندی ناسراو حەسەن زیرەك کە نووسەر لە ئەنجامی ئەو دۆستایەتییە بەتینەی بوویەتی لە گەڵیداو هاوڕێیەکی زۆر نزیکی بووەو توانیویەتی گەلێ ڕووداوو بەسەرهاتی خۆش و ناخۆشی ئەو هونەرمەندە بەناوبانگە تۆمار بکاو لە دووتوێی کتێبێکی جوان و ڕازاوەدا بیانخاتە بەردەستی خوێنەران ..

جگە لە پێشەکی نووسەر خۆی ، کاك لەتیف بەرزنجیش پێشەکییەکی جوان و پڕ مەبەستی بۆ نووسیوەتەوە لەگەڵ ڕێکیدا .. هەروەها کتێبەکە کۆمەڵێ وێنەی حەسەن زیرەکی رەمەندو نووسەری تێدایەو وەکو خۆی دەڵێ کاك « قادر دو مەهدی » بۆیان گرتووە ..

نووسەر لە کۆتایی کتێبەکەدا دەڵێ : « لێرەدا بەشی می ئەم کتێبە کۆتایی پێ دێت . نیازمەندم بەشی دووەمیشی بەسەرهاتەکانی ترو سەردەمی نەخۆشییەکەی و سەرەمەرگو هۆی مردنی تیایە .. » ئێمەیش دەڵێین خۆزگە کاك میرزا کەریم ئەو بەشەشی بەچاپ دەگەیاندو دەیخستە بەردەستی خوێنەران ..

## ● شوان ●

« خوشکۆڵەو براڵەی جگەرسۆزم :

ئەم کۆمەڵێ چیرۆکەی بەردەستت بەرهەمی کاتێکی دیاریکراوەو زوربەیان چاویان بە ڕۆشنایی ژیان کەوتووەو بەهەست و نەستی ڕۆشنبیر ئاشنابوون » .

بەم شێوە کاك عبداللە عەزیز ئاگرین سەرەتای پێشەکی کۆمەڵە چیرۆکەکەی خۆی « شوان » دەنووسێتەوەو بە خوێنەرانی دەناسێنێ ..

« شوان » بریتییە لە « 112 » لاپەڕەی قەبارە بەتاڵی « 23,5 × 16,5 سم » ەو ، لە چاپخانەی ڕۆشنبیریی لە هەولێر سێ هەزار دانەی لێ چاپکراوەو نرخی « 650 » فلسە ، لە کتێبخانەی نیشتمانیی بەغداش ژمارە « 927 » ی ساڵی « 1984 » ی دراوەتێ ..

عەبدوڵڵا عەزۆ دەروێش خەتی بەرگو ناونیشانی چیرۆکەکانی نووسیوەتەوەو هونەرمەند بەختیار مستەفا قەفتانیش نیگاری بەرگو تابلۆی چیرۆکەکانی کێشاوە .

« شوان » دە چیرۆکی گرتوە خۆ کە لە نێوان ساڵەکانی « 1978 — 1983 » دا نووسراونەتەوە . هیوای سەرکەوتن بۆ کاکە ئاگرین دەخوازین و چاوەڕوانی بەرهەمی تری لێ دەکەین ..

## ● دیوانی ناری ●

مامۆستا کاکەی فەللاح پەیتا پەیتا کتێبخانەی کوردی

بەسەر دەکاتەوەو دیدەی خوێنەران بە بەرهەمو بڵاوکراوەی کوردیی تازەو کۆن ڕوون دەکاتەوەو بیرو هۆشیان فراوانترو دەولەمەندتر دەکات .. بەڵگەی ئەم هەقیقەتەیش ئەوەیە کە مامۆستای ئازیزمان تا ئێستا توانیویەتی « 8 » چاپکراوی خۆی ئەنجامبدا کە ئەمانەن .

« سۆزی دەروون ، چرۆ ، لەگەڵ شەپۆلەکاندا ، شێری ساختە ، جگەر گۆشەکان ، کاروانی شیعری نوێی کوردی ، دیوانی کاکەی فەللاح ، چۆلەکە پاساری » .

هەروەها « 16 » بڵاوکراوەیشی ئەنجامداوە کە ئەمانەن :

« سروود بۆ قوتابیان ، مەم و زینی پیرەمێرد ، روباعیاتی خەییام ، چوارینەکانی نەخەعی ، مەولەوی ، هەرچوار بەرگی پەندەکانی پیرەمێرد ، گاڵتەو گەپ ، کەمانچە ژەن ، ئۆدیبی پاشا ، چۆلەکە بچکۆلەکە ، ئەنجوومەنی ئەدیبانی کورد ، دوانزە سوارەی مەریوان ، ئەم دیوانەیش کە لە ساڵی « 1984 » دا بڵاوی کردۆتەوە » .

ئەم ڕەنج و کۆششەی کاکەی فەللاح کە لە ساڵی 1962 ەوە دەست پیدەکات تا ناوەڕاستی ساڵی 1984 مایەی ڕێزو شانازی هەموو ئەدیب و نووسەرو خوێنەرانی کوردە ..

دوا بڵاوکراوەی مامۆستا کاکەی فەللاح « دیوانی ناری » یە ـ مەلا کاکە حەمەی بێلوو ـ کە لە ساڵی 1874 لەدایك بووەو لە ساڵی 1944 دا ماڵئاوایی لێکردووین .. ئەم دیوانە کە ئەمینداریێتی گشتیی ڕۆشنبیریی و لاوانی ناوچەی کوردستان یارمەتی لەچاپدانی داوە کۆکردنەوەو ساغکردنەوەو لەسەرنووسین و پێشەکی « کاکەی فەللاح » ەو ، لە چاپخانەی کاکەی فەللاح « 5000 » دانەی لێچاپکراوەو نرخیشی دینارێکە ، نووسینەکانی نێو دیوانەکە بەلاینۆی « چاپخانەی نەورەس » لێدراوە .

« دیوانی ناری » بریتییە لە « 152 » لاپەڕەی قەبارە گەورەی « 23,5 × 16,5 سم » ەو ، بە ژمارە « 914 » ی ساڵی 1984 سپێردراوە بە کتێبخانەی نیشتمانیی لە بەغدادا ..

هیوای تەمەنێکی درێژ بۆ مامۆستای ئازیزمان دەخوازین و ئومیدەوارین هەمیشە لەم خزمەتەیدا بەردەوام بێت ..

● ناڵی و زمانی ئەدەبیی یەککرتووی کوردی ●

هەر لەبواری لێکۆڵینەوەو ساغکردنەوەدا ، مامۆستا کەریم شارەزای شاعیرو نووسەر ، ئەمجارەیش بەرهەمێکی دیکەی بەچاپگەیاند بە ناونیشانی « ناڵی و زمانی ئەدەبیی یەککرتووی کوردی » .. مامۆستا شارەزا لەچەند دێرێکی پێشەکی کتێبەکەدا دەڵێ :

« نەتەوەی کورد وەکو هەموو نەتەوەیەکی زیندووی ئەم جیهانە زمانێکی تایبەتی خۆی هەیەو ئەو زمانەشی یەکێکە لە خێزانی زمانە ئێرانییە زیندووەکان و ، ئەم خێزانە زمانەش بەشێکە لە کۆمەڵی زمانە هیندۆ ـ ئەورووپایی یەکان » .

دوای ئەم پێشەکی یە نووسەر بەووردی بابەتەکانی خۆی دەخاتە ڕووو شی یان دەکاتەوە کە بریتی یە لە هەشت بەشی سەرەکی و چەندەها بەڵگەی زیندووی هێناوەتەوە بۆ پتەوکردنی بیروڕاکانی خۆی لەمەڕ ئەو زمانە ئەدەبی یە یەککرتووەی کە ناڵی کاتی خۆی پەیڕەوی کردووە ..

ئەم کتێبەی مامۆستا شارەزا بریتی یە لە « 78 » لاپەڕەی قەبارە گەورەی « 23,5 × 16,5 سم » ەو ، لە چاپخانەی « الاديب البغدادي » لە بەغدادا « 3000 » دانەی لێچاپکراوەو نرخیشی « 500 » فلسە ، لە کتێبخانەی نیشتمانیی بەغداش ژمارە « 990 » ی ساڵی « 1984 » ی دراوەتی .

نووسەر بۆ ئەنجامدانی ئەم لێکۆڵینەوە سوودی لە « 30 » سەرچاوەی کوردی وەرگرتووە ، لەگەڵ « 5 » سەرچاوە بە زمانی عەرەبی .. هیوای سەرکەوتن بۆ مامۆستا شارەزا دەخوازین لە بواری خزمەتکردنی ئەدەب و ڕۆشنبیریی کوردیماندا ..

● بەرەو فۆلکلۆر ●

چاپکراوێکی دیکەی کوردی یە ، برای شاعیر کاکە خالد جووتیار بە یارمەتی ئەمینداریێتی گشتیی ڕۆشنبیریی و لاوان لەچاپی داوەو کەلەبەرێکی لە کتێبخانەی کوردیدا پڕکردۆتەوە ،

کاکە خالد لە چەند دێرێکی پێشەکی یەکەدا دەڵێ :

« دیارە ئەگەر سەرەتای سەدەی نۆزدەم بە بیشکەو ڕۆژانی



گروگالی زانستی فۆلکلۆر بزانین ، دەبێ هەوڵ و خۆماندووکردنی نووسەرە دلسۆزەکانی فۆلکلۆری کوردیشمان لەبەرچاوان بێ ، ئەو بنیادەمەی ئێمەش ویستوویەتی بمێنێ ، ژیانی خۆش ویستووە ، بۆ ڕێی هەقیش بنیادەمی مەیدان و تێکۆشان بووە ، ئەو بەرهەمە فۆلکلۆرییانەی ئێستا دەیانبینین هی ڕۆژانی چاو بوونەوەو دووربینی یە » .

« بەرەو فۆلکلۆر » « 15 » بەشی هەمەجۆری لە زانست و قوتابخانەکانی فۆلکلۆر گرتۆتەوە لەگەڵ چەپکێ ناوو زاراوەدا .

ئەم نامیلکەیەی کاک خالد ، « 110 » لاپەڕەی قەبارە بچووکی « 16 × 12 سم » ەو ، لە چاپخانەی « الحوادث » لە بەغدادا « 3000 » دانەی لێ چاپکراوەو نرخی « 500 » فلسەو بە ژمارەی « 1169 » ی سالی « 1984 » سپێرراوەتەوە کتێبخانەی نیشتمانی ی بەغدا ..

هیوادارین کاک خالد جووتیار بەردەوام بێت و بەرهەمی فۆلکلۆری دیکەمان بۆ ئامادە بکات و کتێبخانەی کوردیشمانی پێ دەولەمەند بکات ..

## ● وون بوون ●

کۆمەلە چیرۆکێکی کاک « کەمال سەعدی » یە ، ئەمینداریتی ڕۆشنبیری و لاوان یارمەتی لەچاپدانی داوەو لە بەرگێکی ڕازاوەدا خۆی دەنوێنێ .. ئەم چاپکراوە لە چاپخانەی ڕۆشنبیری چاپکراوەو نرخی 500 فلسە ، لە کتێبخانەی نیشتمانی ی بەغداش ژمارە « 1266 » ی سالی 1984 ی دراوەتێ ..

« وون بوون » بریتی یە لە « 10 » چیرۆك کە لە نێوان سالانی 1980 — 1983 نووسراونەتەوەو هەندێکیشیان پێشتر لە گۆڤارە کوردی یەکاندا بلاوبوونەتەوە .

قەبارەی کتێبەکە 80 لاپەڕەی « 22 × 16 سم » ەو ، بە کاغەزێکی جوان چاپکراوە ، وێنەکانی سەربەرگ بە کامێرای هونەرمەند اسماعیل هەمەوەند گیراوەو خەتی بەرگیش لەگەل ناوی چیرۆکەکان « احمد عبدالرحمن » ی خۆشنووس نووسیونی .. لە بەرگی دواوەیش نووسەر کورتەیەکی ژیانی خۆی نووسیوەتەوە .

## ● چیرۆکەکانی مەم ●

چەند سالێك لەمەوبەر مامۆستا محمد مولود « مەم » بەرگێکی دیکەی چیرۆکەکانی خۆی بلاوکردەوەو پێشکەشی خوێنەرانی کوردی کرد ، ئەگەرچی وەك خۆی دەڵێ « بەرگێکی پڕ لە هەلەو ناتەواوی » بووە ، وا ئەمجارەیش دیسان « مەم » ی چیرۆك نووس چیرۆکەکانی لە بەرگێکی تردا دەخاتەوە بەردەستی ئەدیب و ئەدەب دۆستان ، لە ڕاستیدا ئەو کۆمەلە چیرۆکەی « مەم » کە « 21 » چیرۆکی گرتۆتەوە دەگەڕێنەوە بۆ سالەکانی زوو ـ پەنجاکان و شەستەکان و هەفتاکان ـ وەك نووسەر خۆی ئەوەی ڕوون کردوتەوە ، هەروەها ئەوەیشی ڕاگەیاندووە کە یەکەم چیرۆکی ئەو « پەنجا فلس » نی یە وەك لەنێو خوێنەراندا باوە ، بەڵکو « برسیەتی .. بەهێزترە » یەکەمین چیرۆکیەتی و لە سالی « 1951 » دا لە ناوچەی برادۆست نووسیویەتی و لەگەل ئەم کۆمەلە چیرۆکەدا بلاوی کردوتەوە .. ئەمە جگە لە دوو چیرۆکی دیکە کە لە بەرگی پێشوودا بلاوی کردوونەتەوە ..

« چیرۆکەکانی مەم » « 256 » لاپەڕەی قەبارە گەورەی « 22,5 × 16 سم » ەو ، لە چاپخانەی ڕۆشنبیری لە هەولێر « 5 » هەزار دانەی لێ چاپکراوەو نرخی دیناروو روبعێکە ، لە کتێبخانەی نیشتمانی ی لە بەغدادا ژمارەی « 827 » ی سالی 1984 ی دراوەتێ .. کاك « سعید یەحیا » ی خۆشنووس نەخشەی بەرگەکەی بۆ کێشاوەو ناونیشانی چیرۆکەکانی بۆ نووسیوەتەوە ..

## ● دیدارێکی دوور ●

ئەم چاپکراوەیش هەردیسان لە چاپخانەی ڕۆشنبیری



که سەر بە ئەمیندارێتی گشتی ی ڕۆشنبیریی و لاوانە ـ لە هەولێر چاپکراوە ، نووسەر چیرۆکەکەی کردوتە دوو بەشی سەرەکی کە « 16 » بەشی جیا جیایان پێك هێناوە بۆ ئەوەی بتوانێت ئەو دیدارە دوورە بە شێوەیەکی بەسەریەکەوەو بە ڕێکو پێکی ئەنجام بداو پێشکەشی خوێنەرانی بکات ، ئەم چیرۆکە لە ماوەی (11/1 — 29/3/1983) لە هەولێردا نووسراوەتەوە ،

ئەم کتێبە « 80 » لاپەڕەی قەبارە گەورەی « 22 × 16 سم » ەو ، نرخی « 500 » فلسەو بە ژمارەی « 1328 » ی ساڵی 1984 سپێرراوەتە کتێبخانەی نیشمانی ی لە بەغدادا .. نەخشەی بەرگو خەتەکان کاك « کەریم دیار » ی خۆشنووس ئەنجامی داوون ..

هیوادارین کاکە ڕەزا بەردەوام بەرهەمی تازە پێشکەش خوێنەران و کتێبخانەی کوردی بکات ..

**● ڕێوی ی گەرمیان کوێستان ●**

برای ئازیز کاکە « عومەر ئیبراهیم عەزیز » ی فۆلکلۆر دۆست وا ئەمجارەیش چەند چیرۆکێکی فۆلکلۆری کوردەواریی مندالانی لە مردن ڕزگار کردوو بە تۆمارکراوی و لە دووتوی ی بەرگێکی جوان و ڕازاوەدا خستە بەردەستی جگەر گۆشەکانمان و دیدەی ئەوانی پێ گەشتر کردەوە ..

ئەم کتێبەی کاك عومەر « 8 » چیرۆکی هەمەجۆری تێدایەو هەر چیرۆکەو تابلۆیەکی لەگەڵدا بلاوکراوەتەوە ، کاك « مومتاز حەیدەری » پێشەکی بۆ نووسیوەتەوەو کاك « سەعید » ی خۆشنووسیش وێنەی بەرگو تابلۆکانی ناوەوەی کێشاوە ..

ئەم کۆمەڵە چیرۆکەی مندالان « 84 » لاپەڕەی قەبارە گەورەی « 24 × 17 سم » ەو ، لە چاپخانەی « الادیب البغدادي » لە بەغدادا سێ هەزار دانەی لێ چاپکراوەو نرخی « 500 » فلسە .. لە کتێبخانەی نیشتمانی ی لە بەغدادا ژمارەی « 1324 » ی ساڵی 1984 ی دراوەتێ ..

کاك عومەر لە لاپەڕە « 82 » دا دەڵێ : « ناوەرۆکی چیرۆکەکان فۆلکلۆرین ، بەلام بە شێوەییکی نوێ دارێژراونەتەوە » .

**● فۆلکلۆری کوردی لە ناوچەی دزەییایدا ●**

هەر لە بواری فۆلکلۆردا ، ساڵی پار خوشکە « ئاواز ئەحمەد حەمەدەمین دزەیی » دیاری یەکی نایابی پێشکەش کردین بە ناونیشانی « فۆلکلۆری کوردی لە ناوچەی دزەییاندا » .. ئەو بەرهەمە فۆلکلۆرییانەی نێو کتێبەکە خوشکە ئاواز کۆی کردوونەتەوەو ئامادەی کردوون و لەسەری نووسیون و ، پێشکەشیانی دەکات بە هەموو ئافرەتانی کوردستان و هەموو خوێنەرێکی نیشتمانپەروەر .. هەروەها خوشکە ئاواز پێشەکی یەکی خنجیلانەی بۆ کتێبەکە نووسیوەتەوەو لە دواییشدا خۆی بە خوێنەران دەناسێنێ ..

« فۆلکلۆری کوردی » شەش بەشی سەرەکی گرتۆتەوەو « 104 » لاپەڕەی قەبارە گەورەی « 23 × 17 سم » ەو ، لە چاپخانەی « الادیب البغدادي » لە بەغدادا سێ هەزار دانەی لێ چاپکراوەو نرخی « 850 » فلسە .. لە کتێبخانەی نیشتمانی ی لە بەغدادا ژمارەی « 1171 » ی ساڵی 1984 ی دراوەتێ .. کاك جەعفەر بەرزنجیش سەرپەرشتی لە چاپدانی کردووەو نەخشەی بەرگەکەی بۆ کێشاوە ..

ئەوەی شایانی باسە خوشکە ئاواز جگە لە فۆلکلۆر کۆکردنەوە ، شیعریشی داناوە کە دیارترینیان ئەمانەن : « سوێندم بە نیشتمان » و « کچی لادێ » .

**● دلیل التنسیق لنباتات الظل ●**
**وانتاج ازهار القطف .**

ئەم کتێبەیش بە زمانی عەرەبی یەو ، بە یارمەتی ئەمیندارێتی گشتی ی ڕۆشنبیریی و لاوان لەچاپدراوەو



کەلەبەرێکی چاکی پڕکردوتەوە لە بواری ڕێکخستنو بەرهەم هێنانی گوڵو ڕووەکەکانی سێبەر ، نووسەر کتێبەکەی کردوتە حەوت بەشی سەرەکیو لەهەر بەشێکیدا کۆمەڵێك زانیاری ووردی خستوتە ڕووو چەندەها نموونەی لەو گوڵو ڕووەکانە بەڕەنگاو ڕەنگی بڵاوکردوتەوە کە باسیان لێوە دەکات ..

ئەم چاپکراوە لە نووسینی مامۆستای دکتۆر « طاهر نجم رەسول » ە ، 308 لاپەڕەی قەبارە بچووکی « 16,5 × 12 سم » ە ، لە چاپخانەی زانکۆی موصل چاپکراوە .. لە کتێبخانەی نیشتمانی لە بەغدادا ژمارەی « 614 » ی ساڵی 1984 ی دراوەتیو نرخی دوو دینارە ،

نووسەر لە لاپەڕەی « 5 و 6 » پێشەکییەکی کورتی بۆ کتێبەکەی نووسیوەتەوە ، لە بەرگی دواوەیشدا کورتەیەکی ژیانی خۆی نووسیوە ئەو بوارانەی دیاریی کردوون کە تا ئێستا کاری تێدا کردوون ..

## ● بومە گوتن ●

ئەم بەرهەمەی کاك خالد حسێن بریتییە لە کۆمەڵە چیرۆکێکەو لە بەرگێکی قەشەنگدا بە چاپی گەیاندوونو چیرۆکەکانیشی وەکو کاك خالد خۆی دیاری کردووە، لە ئەدەبی کۆنەوە وەرگیراونو کۆکراونەتەوە ..

کاکە خالد لە لاپەڕە « 93 » دا ناوی ئەو بەرهەمانەی نووسیوەتەوە کە تا ئێستا بەچاپی گەیاندوونو ئەوانەیش کە ئامادەی کردوون بۆ چاپ .

ئەم کتێبە بریتییە لە « 96 » لاپەڕەی قەبارە گەورەی « 24 × 17 سم » ە ، لە چاپخانەی « علاء » لە بەغدادا سێ هەزار دانەی لێچاپکراوەو بە ژمارەی « 1203 » ی ساڵی 1984 سپێرراوەتە کتێبخانەی نیشتمانیی لە بەغدادا .. کاك جەعفەر بەرزنجیش سەرپەرشتی لەچاپدانی کردووە ..

ئەوەی شایانی باسە ئەم کتێبە بە زمانی کوردیو بە شێوەی کرمانجی ژووروو نووسراوەتەوە .

## ● دیوانی لوتفی ●

ئەم چاپکراوەیش بریتییە لە نزیکەی 126 پارچە شیعرو چوارینەی شێخ لەتیفی شێخ ڕەزای بەرزنجی ، ئەم شاعیرەمان لە ساڵی 1905 دا لە دێی « پەڵکانە » ی ناوچەی « قەرەجەسەن » ی سەر بە کەرکوك لەدایك بووەو ئێستاش لە شاری کەرکوك دادەنیشێ .

ئەم دیوانەی شێخ لەتیف « 168 » لاپەڕەی قەبارە گەورەی « 23,5 × 16,5 سم » ە ، لە چاپخانەی « الادیب البغدادي » لە بەغدادا « 3000 » دانەی لێچاپکراوەو نرخی یەك دینارە .. لە کتێبخانەی نیشتمانیی لە بەغدادا ژمارەی « 1370 » ی ساڵی 1984 ی دراوەتێ ..

ئەم دیوانە کاك عبید لەتیف بەرزنجی ئامادەی کردووەو کاك عەبدوڵڵای بابە عەلی بەرزنجی پێشەکی بۆ نووسیوەتەوەو ، عەزیز ڕەشید حەریری نەخشەی بەرگەکەییو ، سەرپەرشتی دەرهێنانی هونەریی کردووە ..

## ● چرۆ ●

ئامێلکەیەکی شیعرییە ئەمینداریێتی گشتیی ڕۆشنبیریو لاوان یارمەتی لەچاپدانی داوەو ساڵی پار کەوتە کتێبخانەکانەوە ، زۆربەی شیعرەکان دەگەڕێنەوە بۆ هەفتاکانو بەشێکیان لە ڕۆژنامەو گۆڤارە کوردییەکاندا بڵاوکراونەتەوەو ئەمجارەیش خۆیان لەنێو ئەم ئامێلکەیەدا دیوەتەوە ..

« چرۆ » 56 لاپەڕەی قەبارە بەتاڵی « 24 × 17 سم » ە ، لە چاپخانەی « علاء » لە بەغدادا سێ هەزار دانەی لێچاپکراوەو نرخی « 350 » فلسە .. بە ژمارەی « 1417 » ی ساڵی 1984 سپێرراوەتە کتێبخانەی نیشتمانیی لە بەغدادا ..

ئەوەی شایانی باسە تابلۆکانی نێو ئامێلکەکە کاکی

هونەرمەند « دارا محمد علي » کردوونی و کاك « نەجات » ی خۆشنووس نەخشەی بەرگەکەی بۆ کردووەو خەتەکانی نووسیوەتەوە .

**● گەشەی منداڵ ●**

مامۆستا جەلال خەلەف ژاڵەیی ئەمسالیش بەرهەمێکی تری لە بارەی دەروون زانی یەوە خستە بەردەستی خوێنەران و کەلەبەرێکی ئەو لایەنە گرینگەی لە ژیانی منداڵدا پێ پڕکردەوەو کۆمەڵێ زانیاری بەکەڵکی بەزمانی کوردی پێشکەش بە کتێبخانەی کوردی کرد ..

مامۆستا جەلال لەچەند دێڕێکی پێشەکی یەکەدا دەڵێ :
« دوای هەوڵێکی زۆرو تەقەلایەکی بێ سنوور ، توانیم بەشێکی کەم لە ئاواتەکانم بێنمە دی و ئەم پەرتووکەتان پێشکەش بکەم لەبارەی دەروون زانی ی منداڵەوە » .

گەشەی منداڵ « 128 » لاپەڕەی قەبارە گەورەی « 23,5 × 16,5 سم » ەو ، لە چاپخانەی « دار آفاق عربية » لە بەغدادا چاپکراوەو نرخی یەك دینارەو لە کتێبخانەی نیشتمانی ی بەغداش ژمارەی « 1396 » ی ساڵی 1984 ی دراوەتێ ..

ئەم کتێبە کۆمەڵێ زانیاری چاکی لەبارەی گیروگرفتەکانی منداڵ لە قۆناغی شیرەخۆریدا تێدایەو شیاوی ئەوەیە بە ووردی بخوێندرێتەوەو سوودی لێوەربگیرێ ..

**● کۆمەڵە شیعری مەلا عەبباس حیلمي کاکەیی ●**

ئەم کتێبە کاك « طالب هەردەوێل کاکەیی » کۆی کردوتەوەو پێشەکی بۆ نووسیوە ، جگە لە شیعرەکانی شاعیر دوو دەستنووس و سێ وێنەیشی تێدا بلاوکراوەتەوە .

کاك هەردەوێل لە کۆتایی کتێبەکەدا فەرهەنگۆکێکی بۆ ئەو ووشەو زاراوانە کردووە کە خوێنەر بە هاسانی لێی حاڵی نابێت ..

ئەم کتێبە 464 لاپەڕەی قەبارە گەورەی « 23,5 × 16,5 سم » ەو ، لە چاپخانەی « اسعد » لە بەغدادا چاپکراوەو نرخی دوو دینارو نیوەو لە کتێبخانەی نیشتمانی ی لە



بەغدادا ژمارەی « 1457 » ی ساڵی 1984 ی دراوەتێ ..

**● لۆرکا .. سێ ترازیدی ●**

وەرگێڕ لە لاپەڕە دووی ئەم کتێبەدا دەڵێ « ئەم کتێبە لە سەرەتاوە بریتی بوو لە سێ ترازیدی ـ زەماوەندی خوێن ، یەرما ، ماڵی بەرناردا ئەلبا ـ ، بەلام لەبەر هەندێ هۆی تایبەتی « زەماوەندی خوێن » م لاداو « مرۆڤی بۆش » م خستە سەر کە بریتیە لە ترازیکومیدیەك » .

ئەم کتێبە بریتی یە لە 200 لاپەڕەی قەبارە گەورەی « 23,5 × 16,5 سم » ەو ، لە چاپخانەی « سلمیٰ الفنیة الحدیثة » لە بەغدادا چاپکراوەو نرخی دیناریکە ، لە کتێبخانەی نیشتمانی ی لە بەغدادا ژمارە « 1157 » ی ساڵی 1984 ی دراوەتێ ..

ئەوەی شایانی باسە ئەم کتێبە لە زمانی ئینگلیزی یەوە وەرگێڕدراوەو هونەرمەند « علي العكيلي » نەخشەی بەرگەکەی کردووە.. وەرگێڕ لە بەرگی دواوەی کتێبەکەدا یەکە یەکە شانۆگەری یەکانی لەچەند دێڕێکدا شی کردوونەتەوە .

**● ڕەشپۆشێکی جیهانی چوارەم ●**

« لە سەرەتای 1983 دا جارێکی کەش هاورێکانم وورەیان خستەوە بەرمو داوای کۆمەڵە چیرۆکی چاپکراویان لێکردم . منیش بە هاندانی ئەوان و بۆ دەربڕینی ڕێزو خۆشەویستیم بەرامبەر بەوان و بەو خوێنەرە بەڕێزانەی دڵسۆزانە پێشوازی چاپی دووەمی « شەهیدانی قەلای دمدم » یان کرد وا ئەم دە چیرۆکەتان لەم بەرگەدا پێشکەش دەکەم » .

ئەم چەند دێڕەی سەرەوە بەشێکی ئەو پێشەکی یەن کە هاوڕێی چیرۆك نووس کاکە مستەفا ساڵح کەریم بۆ کۆمەڵە



چیرۆکی « ڕەشپۆشێکی جیهانی چوارەم » ی نووسیوەتەوەو ، ئەوە ڕادەگەیەنێ کە چۆن ئەم کۆمەڵە چیرۆکە هاتۆتە بەرهەم .. کاکە مستەفا تا ئێستا چەند بەرهەمێکی چاپکراوی هەیە ، جگە لەو بەشداری یە چالاکانەیەی دەیکات لە بواری بەرەوپێش بردنی ئەدەب و ڕۆشنبیری کوردیماندا ..

ئەم کۆمەڵە کورتە چیرۆکەی کاک مستەفا بریتی یە لە « 148 » لاپەڕەی قەبارەی « 23 × 16 سم » ەو ، لە چاپخانەی « الادیب البغدادي » لە بەغدادا شەش هەزار دانەی لێ چاپکراوەو نرخی یەک دینارەو لە کتێبخانەی نیشتمانی ی لە بەغدادا ژمارە « 1393 » ی ساڵی 1984 ی دراوەتێ .. هونەرمەند « اسماعیل خەیات » یش نیگاری بەرگ و تابلۆی چیرۆکەکانی کێشاوە ..

ئەوەی شایانی باسە ئەم دە چیرۆکە لە نێوان ساڵانی 1973 — 1982 نووسراونەتەوە . هیوای سەرکەوتن بۆ کاک مستەفاو چاوەڕوانی بەرهەمی تری ئەم هاوڕێ ئازیزەمانین .

**● هەڵبژاردە لە داب و نەریتی گەلان ●**

ئەم چاپکراوەش هەر دیسان لە زنجیرەی ئەو کتێبانەیە کە یارمەتی دراون ، لەم کتێبەدا کاک « محەمەد بەدری » بەشێکی زۆری لە داب و نەریتی گەلانی جیهان کۆکردۆتەوەو پێشکەشی خوێنەرانی دەکات .. هەر لەم کتێبەدا کە کاک « بەدری » ئامادەی کردووە ، کاک « محەمەدی مەلا کەریم » پێشەکی یەکی سێ لاپەڕەیی نووسیوەتەوەو زۆر لایەنی کتێبەکە ڕوون دەکاتەوە ..

ئەم کتێبە کە « شکر جاسم » نیگاری بەرگەکەی کێشاوە ، « 112 لاپەڕەی قەبارە گەورەی « 24 × 17 سم » ەو ، لە چاپخانەی « الحوادث » لە بەغدادا چاپکراوەو نرخی « 700 » فلسەو ، لە کتێبخانە نیشتمانی ی لە بەغدادا ژمارەی « 1402 » ی ساڵی 1984 ی دراوەتێ ..

**● مێژووی کۆیە ـ بەرگی دووەم ●**

جارێکی دیکەیش مامۆستا « طاهر احمد حویزی » دیدەی خوێنەران و مێژوو دۆستانی ئاودایەوەو بەرگی دووەمی کتێبە نایابەکەی « مێژووی کۆیە » ی بە چاپ گەیاندو ، زەخیرەیەکی چرو پڕی خستە کتێبخانەی کوردی یەوە ..

مامۆستا « طاهر » لەمەڕ کۆکردنەوەی زانیاری یەکانی ئەم بەرگەدا دەڵێ :

« بۆ کۆکردنەوەی زانیاری بۆ بەرگ « بەشی » دووەم ، گوێم لە قسەی زۆر ئیختیارەکان ڕاگرت ، چوومە هەموو « دائرەکانی حکومەت » لە کۆیە . کاربەدەستەکان بەڕوویەکی خۆشەوە ؛ چیم بویستبا لەدەرحەق ڕابردووو ئێستاکەی دائرەکانیان ، وەڵامیان ئەدامەوە ، وە تۆمارەکانیان دەهێنا بەردەستم » ..

بەرگی دووەمی مێژووی کۆیە « 304 » لاپەڕەی قەبارە گەورەی « 23,5 × 17 سم » ەو ، لە چاپخانەی « نمیر » لە بەغدادا چاپکراوەو نرخی دینارێک و 750 فلسە ، لە کتێبخانەی نیشتمانی ی لە بەغدادا ژمارەی « 1536 » ی ساڵی 1984 ی دراوەتێ ..

ئەم کتێبە کاک « سامی عزیز رسول » سەرپەرشتی لە چاپدانی کردووەو بە یارمەتی ئەمینداریێتی گشتی ی ڕۆشنبیری و لاوانی ناوچەی کوردستان چاپکراوە ..

**● باشترین دیاری ؛ بۆ کوردەواری ●**

مامۆستا « محمد شیخ طه بالیسانی » ، بەیتا بەیتا بەرهەمی تازەی ئایینی بە زووبانی کوردی یەوە بە چاپ دەگەیەنێ و دەیانکاتە دیاری بۆ ئەوەی ئەویش بتوانێت لەم بوارەدا خزمەتێک بکات و بەشێکی زۆر لە خوێنەران بەو دونیا فراوانەی ئایینی ئیسلام ئاشنا بکات .. ئەوەتا وا ئەمساڵیش کتێبێکی دیکە بە ناونیشانی « باشترین دیاری ؛ بۆ کوردەواری » بە چاپ گەیاند .. ئەم کتێبە بریتی یە لە دوو بەشی سەرەکی « یەکەم و دووەم » کە ئەم دوو لایەنەی گرتۆتەوە :

● بەشی یەکەم : « باشترین پەند ، چەند دەرسێك لە تەفسیری سورەتی الحمد » .

● بەشی دووەم : « وانەی کورد زوبان بۆ تەجویدی قورئان » .

ئەم کتێبە « 144 » لاپەرەی قەبارە گەورەی « 24 × 17 سم » ەو ، لە چاپخانەی « شفیق » لە بەغدادا چاپکراوەو ، نرخی 750 فلسەو لە کتێبخانەی نیشتمانی ی لە بەغدادا ژمارەی « 1160 » ی سالی 1984 ی دراوەتێ ..

وەرگێر لەم کتێبەیدا سوودی لە چواردە سەرچاوەی ئایینی وەرگرتووەو لە لاپەرەی « 139 » دا ناوەکانی تۆمار کردوون ، هەروەها ئەو بەرهەمە چاپکراوو چاپ نەکراوانەی خۆیشی نووسیونەتەوە کە بە هەردوو زوبانی کوردی‌و عەرەبین ..

● ئۆلدوزو بووکە شووشەی قسەکەر ●

هەر لە بواری وەرگێراندا برای ئازیزمان کاکە غەریب پشدەری شاعیر دیاری یەکی خنجیلانەو بەپێزی پێشکەش مندالانی کورد کردووە، کە ئەویش « ئۆلدوزو بووکە شووشەی قسەکەر » ی صەمەدی بیهرەنگی یە ، ئەم دیاری یەی کاکی پشدەری بۆ مندالانی کورد زۆر لەجێگای خۆیدایەو شایانی ئەوەیە هەموو مندالان بیخوێننەوەو فەراموشی نەکەن ، بۆیە ئێمەیش هەر هێندەی لەبارەیەوە دەلێین‌و سەرنجی ئەوان رادەکێشین بۆ خوێندنەوەیەکی ووردو قوڵی کتێبەکە ..

ئۆلدوزو بووکە شووشەی قسەکەر نزیکەی حەوت مەلزەمەی قەبارە ناوەنجی « 21 × 15 سم » ەو ، لە چاپخانەی « دار الجاحظ » لە بەغدادا چاپکراوەو نرخی 750 فلسە ، لە کتێبخانەی نیشتمانی ی لە بەغدادا ژمارەی « 1531 » ی سالی « 1984 » دراوەتێ ..

ئەوەی شایانی باسە وەرگێر پێشەکی یەکی کورتی بۆ کتێبەکە نووسیوەو فەرهەنگۆکێکیشی بۆ ئەو ووشە گرانانە داناوە کە لە نێو کتێبەکەدا هاتوون ؛ هیوادارین کاکی پشدەری مندالان لەم جۆرە دیاری یانە بێبەش نەکاتو ، بەیناو بەین بەسەریان بکاتەوە ..



● دەروازەی دراما ـ بەشی دووەم ●

کاك ئەحمەد سالاری ئەکتەرو هونەرمەندو نووسەر وا ئەمجاریش هیوا خوازی یەکەی دێتە دی‌و بەرگی دووەمی « دەروازەی دراما » ش لەدایك دەبێ‌و لەگەلیشیا بریاری ئەوە رادەگەیەنێ کە دەست لەو پرۆژەیە هەلنەگرێ ، تا هێزو گور لە بیرو خامەکەیدا هەبێ .. بەم سووربونە کاکە سالار پێشەکی بەشی دووەمی « دەروازەی دراما » دەنووسێتەوەو ئەوە رادەگەیەنێ کە هەمیشە خامەکەی لە خزمەتی هونەردا بێت‌و هەنگاوی گەورەو بەسوود بهاوێژێت ، بۆ بەرەوپێش بردنی شانۆی کوردیمان ، هەلبەتە ئەم کارەیش مایەی شانازی‌و خۆش بەختی ی هەموو مرۆڤێکی دلسۆزە بۆ گەلەکەی‌و بۆ گەشەپێدانی رۆشنبیری کوردی

کاکە سالار وەکو وەفاداری یەك بۆ مامۆستای شاعیر « مەلا عەبدوللای زێوەر » شیعرێکی ئەوییان بە ناونیشانی « دیاری زێوەر » دەکاتە سەرەتای کتێبەکەی‌ی‌و ئیتر دەچێتە نێو باسەکانی شانۆو گەلێ لایەنی وورد لەم بوارەدا روون دەکاتەوە .

ئەم کتێبەی سالار بریتی یە لە « 112 » لاپەرەی قەبارە ناوەنجی « 21 × 15 سم » ەو ، لە چاپخانەی « الجاحظ » لە بەغدادا چاپکراوەو نرخی « 750 » فلسەو لە کتێبخانەی نیشتمانی ی لە بەغدادا ژمارەی « 1532 » ی سالی « 1984 » ی دراوەتێ ..

نووسەر بۆ ئەنجامدانی ئەم بەشەی دووەمی پرۆژەکەی سوودی لە « 30 » سەرچاوە وەرگرتووەو ، « 11 » باسی سەرەکی لە بارەی شانۆوە دەخاتە روو .

ئێمەیش دەلێین سەرکەوتن بۆ کاك ئەحمەد سالارو شانۆو هونەری کوردیمان ..

● لیرەیەك لە گەنجینەی نەتەوەی کورد ●

بە ئامانجی رزگارکردنی بەرهەمە فۆلکلۆریەکانمان لەدەست فەوتان و بزربووندا و، بۆ ئەوەی ئەم لایەنەی ئەدەبی هەمیشە زیندووی میللەتەکەمان تا هەتایە هەر بە زیندوویی بمێنێتەوە، لەم سالانەی دواییدا بەشێکی زۆر لە ئەدیب و نووسەران روویان لە فۆلکلۆر کردوو بەپێی توانا بەشێکی چاکیان لەو بەرهەمە لە مردن رزگار کردو بە تۆمارکراوی خستیانە نێو کتێبخانەی کوردییەوەو، کەلەبەرێکی گەورەیان پێ پڕکردەوە، جا ئەگەرچی هەندێ لەو هەوڵ کۆششانە زۆر ساکار بوون، بەلام هەردیسان سوودبەخشن و زەمینەیەکی لەبار دەرەخسێنن بۆ ئەوەی لە داهاتوویەکی نزیکدا، نووسەران و فۆلکلۆر دۆستان ووردترو قووڵتر روو لەو مەیدانە بکەن و زانستانە لەو بەرهەمانە بکۆڵنەوە کە تا ئێستا تۆمار نەکراون و چاوەڕوانی هەوڵ و تەقەلای دڵسۆزانەی ئەوانن.

ئەوەتا کاکە « ئەسعەد عەدۆ » لە کۆتایی ساڵی پاردا لیرەیەك دەخاتە سەر گەنجینەی نەتەوەی کوردو کۆمەڵە بەرهەمێکی دیکە لە مردن رزگار دەکا و لە دوو توێی کتێبێکی نایابدا تۆماریان دەکات ..

« لیرەیەك لە گەنجینەی نەتەوەی کورد » « 128 » لاپەڕەی قەبارە گەورەی « 24 × 17 سم » ەو، لە چاپخانەی « عەلا » لە بەغدادا چاپکراوەو نرخی « 750 » فلسەو لە کتێبخانەی نیشتمانیی لە بەغدادا ژمارەی « 1551 » ی ساڵی « 1984 » ی دراوەتێ.

ئەوەی شایانی باسە نووسەر فەرهەنگۆکێکی بۆ ئەو ووشەو زاراوانە کردووە کە تایبەتین بە ناوچەیەك و لە ناوچەیەکی تردا زۆر باونین، هەروەها ناوی ئەو کەسانەیشی بردووە کە سوودی لێوەرگرتوون بۆ ئامادەکردنی ئەم کتێبەی.

هیوای سەرکەوتن بۆ کاك ئەسعەد دەخوازین و چاوەڕوانی بەرهەمی تری لێدەکەین ..

● دووا ووتە ●

بەم جۆرە ئەمینداریتی گشتیی رۆشنبیریی و لاوانی ناوچەی کوردستان، لە ماوەی « 12 » مانگی ساڵی 1984 دا توانی « 40 » کتێبی کوردیی و عەرەبی لە هەموو بابەتەکانی ئەدەب و رۆشنبیریدا بەچاپ بگەیەنێ، لەوانە حەوت کتێبی بە زمانی عەرەبیی و ئەوانی دیکەش بە زمانی کوردی بوون.

لەڕاستیدا ئەم دەزگایە لە ماوەی سێ ساڵی رابردوودا هەوڵ و کۆششێکی بەردەوامی بووە بۆ دەوڵەمەندکردنی کتێبخانەی کوردیی و، یارمەتیدانی ئەدیب و نووسەرە کوردەکانمان، ئەگەرچی بەشێکی زۆری ئەو بەرهەمانە لەزۆر لایەنەوە تێروتەسەل نەبوون و لاوازییەکی ئاشکرایان پێوە دیاربووە، بۆ ئەم راستیەش دەڵێین، بە پلەی یەکەم بەرهەمە شیعرییەکان لەم جۆرە بابەتانە بوون، ئینجا بەرهەمەکانی تر، لەکاتێکدا دەبوایە زوربەی هەرە زۆری ئەو چاپکراوانە، هەڵبژاردە بوونایەو نیشانەکانی گەشەکردن و بەرەوپێش چوونی کاروانی رۆشنبیریی کوردییان بە سیماوە دیاربوایەو، کەلەبەرێکی گەورەیان پڕبکردایەتەوە ..

هەر لەم روانگەیەشەوە دەڵێم خۆزگە نووسەرانمان بیریان لەوە دەکردەوەو مەبەستیان تەنها ئەوە نەدەبوو کە هەر بەرهەمیان « زۆربێ و بۆربێ »، بەڵکو هەوڵی ئەوەیان دەدا، ئەو دیارییەی پێشکەش بە خوێنەرانی دەکەن بەرهەمێکی بەپێزو دەوڵەمەند بێت لە هەموو روویەکەوە ..

هیواخوازیشم کە ساڵی دادێ ئەمینداریتی هەنگاوی مەزنتر بهاوێژێت و، گورج و گۆلانەتر بەرەو قۆناغێکی دیکە رێگە ببرێت و ئەو بەرهەمانەیش هەڵبژێرێ بۆ یارمەتیدان و چاپکردن کە بەراستی نموونەی پێشکەوتن و رەسەنایەتی ئەدەبەکەمانی پێوە دیارەو، دەبنە مایەی بەختەوەری بۆ هەموو کورد زوبانێك ..

لە کۆتاییدا مژدەی ئەوە رادەگەیەنین و دەڵێین: جوانترین دیاریی ساڵی « 1985 » ی ئەم دەزگا رۆشنبیرییە، دیوانە نایابەکەی شاعیری نەمر « حاجی قادری کۆیی » دەبێت، کە ئێستا وا لەژێر چاپدایەو لە ماوەیەکی کەمدا دیدەی خوێنەرانی پێ روون دەبێتەوە ..

ئێتر تا ئێرەو تا راپۆرتێکی دیکە: هەر سەرفرازبن و هەربژین ..

# كاروان


مجلة ثقافية شهرية
تصدرها الامانة العامة للثقافة والشباب
باللغتين الكردية والعربية

رئيس التحرير
محمد أمين محمد احمد

30

اذار ١٩٨٥ السنة الثالثة


في هذا العدد




العنوان : اربيل ـ الامانة العامة للثقافة والشباب ـ مجلة كاروان ...

# شهريات كاروان الثقافية

اعداد : أ. كوّدو

شهدت الحركة الثقافية في منطقة كردستان في الاسابيع الاخيرة، عدداً من الانشطة الثقافية والفنية التقليدية التي نفذتها منظمات ومؤسسات ثقافية ومهنية وغير مهنية .

**ـ « نادي السينما » ـ**

لقد اطلق بعض المثقفين والادباء في اربيل عنوان «نادي السينما» على فعالية سينمائية تقدم في مديرية الثقافة الجماهيرية باربيل في الرابع من كل شهر . ومما جعل من فكرة النادي اكثر اثارة ، هو عرض اعضائه في الآونة الاخيرة وبشكل منتظم لعدد من الافلام ، آخرها الفلم الامريكي الموسوم بـ «العهد الجديد» وهو من سيناريو «كريستوفر فراي» وموسيقا «توشيرو مايوزومي» واخراج «جون هيستون» والذي عرض من خلال شاشة جهاز للتلفزيون في المديرية المذكورة وعن طريق جهاز «الفديو . وبعد الانتهاء من عرض الفلم ، جرت مناقشته بعد ذلك من قبل عدد من اعضاء النادي ، والذين ناقشوا محتوى الفلم وجوانبه الفنية كل من الاساتذة :

1 ـ جودت احمد ناجي
2 ـ حسين رشواني .
3 ـ جلال خوشناو .
4 ـ الدكتور حيالي .
5 ـ اسعد عدو .

وقد استغرق عرض الفلم ومناقشته حوالى 3 ساعات ، وحضر العرض جمهور غفير من الادباء والفنانين والمهتمين بالفن السينمائي وافلام الفديو.

تعود فكرة تأسيس «نادي السينما» الى عام 1979 . ولكن لاسباب فنية تم تأجيل ترجمتها الى حين التنفيذ وفي عام 1981-1982 خطت الثقافة الجماهيرية باربيل خطوات عملية لتنفيذ الفكرة، وقدمت لروادها عدداً من الافلام المعروفة مثل : عمر المختار لمخرجه : مصطفى العقاد . و «ستشرق الشمس ثانية» لمؤلفه : ارنست همنغواي و «انتخبوا الاستاذ سليمان عبد الباسط من اخراج محمد عبد العزيز وافلاماً اخرى غيرها .

**ندوات :**

● نظمت مديرية الثقافة الجماهيرية في السليمانية ندوة ادبية حول الشعر الكردي الحديث ، وذلك في مساء يوم 1985/1/10 في قاعة اتحاد نقابات العمال ، واشترك في الندوة كل من الكاتب الشاب بهات قرداغي والشاعر الشاب محمد عمر عثمان . ومن الذين تقدموا بآراء وملاحظات انتقادية حول الامسية كل من : محمد رشيد فتاح وعبدالكريم حسن وآخرون غيرهما .

● في 1985/2/6 نظم فرع اتحاد الادباء والكتاب الاكراد في دهوك امسية شعرية للشاعر الشاب «نجيب بالايي» الذي قرأ عدداً من قصائده امام جمهور كبير . وبعد الانتهاء من قراءاته الشعرية ، دارت المناقشات حول قصائده ، اشترك فيها كل من : كريم فندي وفاضل عمر وعبدالله جندي ، وهشيار ريكاني ونزار محمد سعيد وشفان علي .

● في 1985/2/7 نظمت مديرية الثقافة الجماهيرية في دهوك امسية ادبية للاستاذ : أمين عثمان حول اللغة الكردية . وقدم الاديب «حجي جعفر حارس» المحاضر الى الجمهور ، ثم رحب الاستاذ صلاح الدين سعيد باسم الثقافة الجماهيرية بالجمهور الذي حضر الى الندوة . ومن الجدير بالذكر ان الاستاذ «أمين عثمان» هو من مواليد دهوك عام 1927 واتحف المكتبة الكردية بمؤلفين له هما : «الخبز والحياة ـ 1969» و «اللغة الكردية والاوربية ـ 1981» اضف الى ذلك مساهماته القيمة في تأليف الكتب الكردية للمدارس .

● في 1985/2/8 نظم فرع اتحاد الادباء والكتاب الاكراد في دهوك ندوة ادبية بعنوان «ف» و «و» في قواعد اللغة الكردية القى

خلالها الاديب الشاب «فاضل عمر» محاضرة في اللغة، وبعد ان انتهى المحاضر من تقديم محاضرته ، ناقشه 11 أديباً ومثقفاً من ادباء ومثقفي مدينة دهوك .

ولد الاديب فاضل عمر عام 1962 في دهوك وقد نشر العديد من الدراسات والمقالات في الصحف والمجلات حول اللغة الكردية ، وهو الآن طالب في كلية الطب .

**معارض :**

في 9-1985/2/12 اقام مركز الاشغال اليدوية في المديرية العامة لتربية اربيل معرضاً عرض فيه نتاجات طلبة دورات المركز من معلمي ومعلمات محافظة اربيل ، والذي اثار اهتمام رواد المعرض كان : «كاوه الحداد وراس الطاغية ضحاك» و «الشاعر نالي» و «ميخائيل انجيلو» و «مدفع الاسطى رجب» و «قلعة اربيل» و «اسرة فلاح» .. الخ من اللوحات التشكيلية .

● في 9-1985/2/11 اقامت جمعية المصورين العراقيين/فرع اربيل معرضاً جميلاً للفنان نبيل خضر رشيد ، الذي عرض عدداً من الصور الفوتوغرافية مثل : «المرأة» و «طفل كردي بريء» و فرقة اربيل لكرة القدم» و «آثار مدينة اربيل» وغيرها من الصور .

**مسرح :**

● **الركض وراء السراب**

في اوائل كانون الثاني من هذا العام 1985 قدم الفنانون الشباب في «چوارقورنه» مسرحية «الركض وراء السراب» من تأليف الاستاذ عبدالله ميديا واخراج : محمد ملا اسعد وتمثيل : بكر عبدالله سور ، محمد حاجي قادر ، عبدالرحمن نبى ، شيرين ابراهيم ، وسعدون محمد بولى . وحضر عرض المسرحية ، جمهور غفير من ابناء چوارقورنه .

● **مصير انسان :**

من تأليف الكاتب السوفيتي «ميخائيل شولوخوف» وترجمة «الدكتور عبد الرحمن حاجي معروف» قدم الفنانون الشباب في قضاء رانية مسرحية «مصير انسان» ومن الجدير بالذكر ان «مصير انسان» قصة قصيرة رائعة ، اعدها الفنان سيامند مامه وحولها الى مسرحية عرضت من قبل فرقة رانية للتمثيل وشاهدها المئات من الناس .

● **مسرحيتان لتشيخوف .**

قدم طلبة اعدادية التجارة في السليمانية ولمدة عشرة ايام مسرحيتان لتشيخوف هما : «أغنية التم» و «الذكرى» للقاص والمسرحي الروسي انطوان تشيخوف» . من الجدير بالذكر ان المسرحية الاولى من ترجمة احمد سالار واخراج سوران صديق وتمثيل : صلاح احمد رشيد ، شوبو محمد . وكمال عمر» .
أما المسرحية الثانية فانها من ترجمة : جلال تقي واخراج : ارسلان محمد علي وتمثيل : آزاد قادر ، ريزان محمد ، ارسلان محمد ، شوبو محمد . أنور محمد . آرام جمال وبختيار كريم» .

● **الأمـــل .**

قدمت فرقة رانية للتمثيل مسرحية «الامل» وهي من تأليف : «علي عباس» واخراج احمد حسين وتمثيل : بيان غريب . احمد حسين حسن . رزگار محمود ، سوران احمد ومصطفى بكر» .

**كتب :**

**الكاكائية .**
**بحث وتحقيق : محمد امين الهوراماني**

كتاب يقع في 306 صفحة من القطع الكبير، طبع على نفقة «علي بوسكاني». يبحث هذا الكتاب الذي قدم له أمين الشيخ علاء الدين النقشبندي في الكاكائية، بشكل واف ومسهب، وقد إستعان المؤلف بمصادر ومعلومات غزيرة للغاية في بحثه وتحقيقه. طبع الكتاب في مطبعة الحوادث ببغداد.

**خورباران .. من جديد.**
**قصائد للشاعر : انور مسيفي.**

كتاب يقع في 74 صفحة من القطع الصغير، طبع على نفقة عدد من اقرباء واصدقاء الشاعر اضافة الى نفقته، تبحث قصائد الديوان في هموم ومعاناة الانسان الكردي المعاصر. طبع الكتاب في مطبعة شفيق ببغداد.

● **الرجل العجوز.**
**مسرحية : مكسيم غوركي**
**ترجمة : عبدالوهاب الطالباني**

مسرحية من اربعة فصول، ترجمها المترجم الى اللغة الكردية وتقع في 102 صفحة من القطع المتوسط وهي من منشورات دار الثقافة والنشر الكردية، إن مؤلف هذه المسرحية غني عن التعريف، كما أن المضمون الانساني لـ «الرجل العجوز» غني عن التعريف ايضاً بقي ان نعلم انها، اي المسرحية، ستساهم في اثراء المسرح الكردي. طبعت في الدار العربية للطباعة ببغداد.

● **جوهرة من كنز الكرد.**
**تاليف : اسعد عدو.**

كتاب يبحث في الفولكلور الكردي ويتناول عدداً من الحكايات والاساطير الكردية الشهيرة، طبع على نفقة الامانة العامة للثقافة والشباب، ويتضمن الكتاب معجماً صغيراً بـ 275 كلمة، الكتاب من القطع المتوسط ويقع في 130 صفحة. طبع في مطبعة علاء ببغداد.

● **الانهار :**
**قصائد من تاليف : شيركو بيكه‌س.**

ديوان شعري يتألف من ست قصص شعرية كتب بخط جميل وهو من مطبوعات الامانة العامة للثقافة والشباب ويقع في 186 صفحة من القطع المتوسط، ان الشاعر شيركوبيكه‌س صوت متميز في الشعر الكردي المعاصر ومن اشهر شعرائه اليوم. طبع الكتاب في مطبعة «علاء» ببغداد.

● **اقوال من الحياة.**
**اعداد وترجمة : محمد عبدالرحمن زنكنه**

يقع هذا الكتاب في 80 صفحة من القطع المتوسط طبع على نفقة المؤلف، ويتضمن العشرات والمئات من الاقوال المأثورة والحكم، ومن الجدير ان الكتاب سبق وان نشر الجزء الاول منه قبل سنين وقبل اسابيع تم نشر الجزء الثاني منه. طبع الكتاب في مطبع دار الجاحظ ببغداد.

● **امراة متشحة بالسواد من العالم الرابع.**
**قصص من تاليف : مصطفى صالح كريم.**

مجموعة قصص قصيرة كتبها المؤلف بعد اواسط السبعينات وقد سبق وان ترجمت قصتان منها الى اللغة العربية من قبل مترجمين اكراد، تبحث مضامين هذه القصص في هموم ومعاناة الانسان الكردي وتطلعاته القومية المشروعة، الكتاب من القطع المتوسط ومن منشورات الامانة العامة للثقافة والشباب.

من التراث الشعبي القصصي الكردي

# تاج الهدهد

عبدالغني علي يحيى

قيل والعهدة على الراوي:

إنه كان في قديم الزمان، ملك عادل، احبه الناس والحيوان والطير، واشادوا بعدالته ورأفته، فكان ان تمتع بسلطان على جميع الاحياء، وتحت ظلال عدالته، لم يشكُ أحد في عصره من ظلم أوحيف، فقد عرف بنصرته للحق والعدل والاخذ بالرأي السديد، والاستئناس باقوال الاحياء ولاسيما الطيور من هذه الاحياء. وفي ذات يوم، تزوج هذا الملك على دين الله ورسوله، من فتاة حسناء، طبقت شهرة حسنها الآفاق، وبعد زواجه منها، أبدى لها الرعاية والعناية، فتفنن في ذلك، وسخر كل ماوصلت اليه يده من أجل اشاعة المسرة في قلبها ودفع الكرب عنها. ورويداً رويداً، راحت اركان سلطانه تتزعزع أمام سلطان جمالها، الى ان خضع سلطانه لسلطان حسنها، واخذ يبتعد بمرور الايام عن العدالة، واخذت العدالة ايضاً تبتعد عنه، فاتسعت الهوة بينه وبين محبيه من ناس وحيوان وطير، وكاد ان يفقد نفوذه تماماً جراء ذلك، لولا الحادثة التالية:

في ظهيرة صيف ما، كانت الشمس تتوهج في الاعالي، والدنيا تكاد تغلي بتأثير من حرارتها المحرقة في تلك الظهيرة، توجهت الملكة، زوجته للسباحة والاغتسال في عين تقع في البراري، ولم يكن في أطراف العين، شجر او صخر لحماية الملكة من الحر وتوفير الظلال لها. فأمرت الملكة زوجها الملك: بان ينادي على الطير في الدنيا كي يقبل لصنع مظلة تحول دون وصول اشعة الشمس اليها. وامر الملك الطيور جميعها، ان تتجمع عند المكان الذي كانت امرأته تسبح فيه، وتنفيذاً لطلبها الذي لم يكن يقبل الرد، فان زوجها الملك الذي كان يجيد لغة الطير وبقية الكائنات الحية، امر جميع الطيور في الدنيا، ان تتجمع في الفضاء الذي كان يعلو المكان الذي كانت زوجته تسبح فيه، وان تؤلف مظلة تعطي الفيء للملكة، فتصون بذلك جسدها الناعم من حرارة الشمس المحرقة.

واقبلت الطيور، فرادى وازواجاً واسراباً من شرق وغرب، وشمال وجنوب، وكل حدب وصوب، حتى كادت ان تحجب السماء عن الارض، عندما استقرت ساكنة في الفضاء الذي كان يعلو مكان السباحة، ثم شرعت بتشكيل مظلة هائلة، حجبت في النهاية تماماً شعاع الشمس عن جسد الملكة. ومن بين الطيور التي لبت أمر الملك، طائر الهدهد، الذي حضر بدوره مع بقية الطيور، واشغل بجسده الصغير الجميل، حيزاً من الفضاء اللامتناهي. غير ان هذا الطائر الصغير، عندما صار قطعة من المظلة الضخمة، فان التعب بمرور الوقت، اخذ يهد من قواه، فحنق، ومع اشتداد تعبه كان حنقه يشتد، الى ان شرع في النهاية يفكر مع نفسه كالآتي:

[.. إنها العبودية بعينها، دعوة جميع طيور الدنيا لصنع مظلة تقي زوجة الملك من حرارة الشمس !!.. إن على الكائنات الحرة الابية ان ترفض الظلم بانواعه].

واستطرد مع نفسه قائلاً:

[.. إنه الاستغلال بعينه، الاستغلال، وإلا فباي حق يستغل هذه الاسراب الهائلة من الطيور المسكينة الضعيفة].

واضاف:

[.. إن الله يكره العبودية والاستغلال، وخلقنا احراراً سواسية].

ان مثل هذا التفكير، دفع تدريجياً بالهدهد في سريرته الى التشكي والتذمر اولاً ومن ثم الى التمرد والعصيان، فالخروج على طاعة الملك واوامره، وانتهى به التفكير مع نفسه الى القول:

[هب ، اني عصيت اوامره، وخرجت على إرادته ، فماذا سيفعل معي ، ماذا يفعل ؟] ورد بنفسه على تساؤله :

[القتل ، نعم سيقتلني ، ولكن القتل الموت ولا العبودية] .

وقال ذلك مع نفسه ، وشق عصا الطاعة ، فترك المظلة وغادرها ، ثم صفق بجناحيه ، مرتفعاً في الفضاء الواسع الكبير، بعد ذلك طار يخترق الاجواء كالسهم ، باتجاه بقعة نائية مجهولة ، وسط استغراب وخوف الطيور من جهة واحتجاج وغضب زوجة الملك من جهة ثانية ، لقد كان لانشقاق الهدهد ، دوي هائل !

أحدثت مغادرة الهدهد للمظلة ثغرة ضيقة صغيرة فيها ، ثغرة بحجم الهدهد ، لكن الثغرة هذه بالرغم من صغر حجمها ، فانها تركت المجال لشعاع الشمس المحرقة اللاهبة أن ينفذ من خلالها ويتسلل الى جسد زوجة الملك ، فيحرق الموضع الذي وقع عليه . ويجعله اسود بلون الفحم . وآلم الملكة ذلك وأستاءت وغضبت على الهدهد ، فقامت والغت حمامها ، وانصرفت الطيور على أثر ذلك متفرقة في الفضاء ، شذر مذر ، مذعورة وجلة ، خائفة من بطش الملك بهن بسبب مابدر عن الهدهد من تمرد وعصيان وانشقاق !

ولّت الطيور الادبار ، واختفت مؤقتاً في الغابات والمغاور والكهوف ، على الرغم من يقينها بقدرة الملك على مطاردتهن واعتقالهن بل ومعاقبتهن ، متى شاء واراد .

وعادت الملكة حزينة كئيبة الى قصر الملك ، تغلي حقداً وغضباً ، وعندما بلغت القصر، والتقت بزوجها الملك ، فان اول مافعلته هو ان اخبرت الملك بما فعله الهدهد ، وكيف انه رفض المظلة ، وعصي امره وسلطانه ، ففر الى جهة مجهولة ، مما سبب إحراق بقعة من جسدها تحت تأثير حرارة الشمس المحرقة ، وكللت شكواها بصيحة غاضبة اطلقتها في وجه زوجها الملك ،

ودعت الى معاقبة الهدهد على فعلته ودق عنقه ، لكي يكون عبرة لمن اعتبر، ولكل من تسول له نفسه عصيان اوامر الملك وسلطانه .

ودهش الملك من تصرف الهدهد ، وغادر الملكة غاضباً مقطب الجبين محمر العينين ، وارسل الى عدد من الطير في الانحاء ، واختار من بينه الباز، وطلب منه ان يتعقب الهدهد ويفتش عنه في ارجاء الدنيا ، ويعثر عليه ، ثم يجيء به الى القصر حياً او ميتاً . والا فانه ، اي الباز، سيدفع رأسه ثمناً لاهماله واخفاقه وتقصيره .

وطار الباز وحلق ، فعبر الجبال والوديان والانهار والغابات والصحارى والبحار ، بحثاً وتفتيشاً عن الهدهد ، وفي تجواله ، سأل عنه الرعاة والرحالة والقبائل ، وقطعان الماشية واسراب الطيور، بعد ذلك جمع اخباراً شتى عن رحيل الهدهد ، حللها وربط بين اجزائها ، بعد ذلك ، وبعد مضي اسابيع ، اهتدى الى المكان الذي اختبأ فيه الهدهد ، وكان موضعاً في جبل شاهق عاصي . فتوجه اليه طائراً ، ولما دنا منه ، ألفاه منيعاً من الصعب الوصول اليه واخراج الهدهد منه بالقوة .. وفكر باساليب عدة لاقناع الهدهد واخذه الى الملك . ونادى على الهدهد حين وقف بالقرب من مدخل المكان ، وعندما جاء الهدهد ، سلم عليه الباز، ورد عليه الهدهد السلام ، وقال الباز للهدهد :

- لماذا فعلت ذلك ؟

رد الهدهد :

- انا لم افعل شيئاً باستثناء ممارستي لحريتي ..
- اتعلم ان الملك حانق عليك ؟
- اعلم ، ولهذا السبب اخترت هذا المنفى .
- الا تعلم بانه يتعقبك ؟
- لقد توقعت ذلك .
- وانا رسوله اليك لآخذك إليه .. حياً او ميتاً .
- هكذا !
- نعم .
- أنا لااخشى بطشه وتنكيله بي على قول كلمة حق ..
- لكنك ، ان ابيت الخروج ، ورفضت طلبه فانه سيدق عنقي نتيجة لذلك .
- أنا ، لامانع لدي من انقاذك .. والذهاب اليه ..

وسر الباز وقال :

- احقاً تأتي معي ؟ .
- نعم ..
- هيا لنذهب ..
- ولكن بشرط..

- ما هو؟
- ان يرد على سؤال اتقدم به الى مقامه ، بعد ذلك ليفعل مايشاء ..
- سأعود اليه لابلغه بشرطك .
- وداعاً ..
- وداعاً ..

وعاد الباز من حيث اتى ، وبعد اسابيع وصل الى قصر الملك ، ودخله خائفاً وجلاً ، ولما رآه الملك ، صاح بوجهه غاضباً وقال :

- اين الهدهد ايها التعس ؟

رد عليه الباز قائلاً :

- سيدي لقد عثرت عليه في مكان ناء بعيد وابلغته قرارك وامرك ، غير ان له سؤالاً يلح على اجابته من قبلكم .. قبل ان تنزل فيه العقاب ، فهل تجيب على سؤاله ؟ .

وفكر الملك ملياً ، واستغرق به التفكير، وحار من امر الهدهد ومن طبيعة السؤال الذي سيوجهه اليه ، وقال مع نفسه :

[انه مجرد سؤال واحد ، لاضير من الرد عليه] .

ثم راح يناقش نفسه بنفسه قائلاً :

«ترى ماذا يخبيء سؤال الهدهد» وبعد مناقشة طويلة مع نفسه ، أعلن موافقته على شرط الهدهد ، وارتفع الباز في الفضاء وفي ظرف اسابيع وصل الى بيت الهدهد فوقف ببابه ، وسلم ، ورد الهدهد عليه السلام ، وابلغه الباز موافقة الملك على الرد على سؤاله ، آنذاك خرج الهدهد ، وراح الهدهد والباز يشقان اجواء الفضاء باتجاه قصر الملك .

بعد اسابيع بلغا قصر الملك ، ولما رأى الطير والناس الهدهد ، استولى عليهم العجب ، واخذتهم الدهشة ، وشملوه بنظرات تقطر رحمة وشفقة . لكن الهدهد ، لاح مرفوع الجبين ، لايأبه بشيء ، ولا يعير لنظراتهم اهتماماً أو يعطيها وزناً ، وحين صار امام الملك وجهاً لوجه ، فانه لم يفقد رباطة جأشه ، بل على النقيض من ذلك ، فقد ارسل الى الاشياء والجند حواليه نظرات لامبالية ، واكتفى بان سلم على الملك وجلس . وحين رد عليه الملك السلام ، قال له على عجل من امره وبغضب :

هات سؤالك ، ايها الشقي المتمرد على سلطاني !

وبهدوء ورباطة جأش قال الهدهد :

- مولاي الملك ، من هم اكثر عدداً في دنيانا ، الاموات ام الاحياء من البشر؟ ولم يطل التفكير بالملك ، بل اجاب على الفور :
- الاحياء .
- كيف ؟ ..
- إذا مات فرد كل يوم ، فهناك عشرة يولدون ، ويوماً بعد يوم تضيق الارض بالاحياء من البشر !
- اتعد الجبناء والعبيد احياءً ايضاً ؟
- كلا !

قال الهدهد آنذاك :

- اذا ، انت لست بحي ، لأنك خائف رهن اوامر امرائك ! ..
- أنا ؟
- نعم انت !
- كيف ؟
- باعتدائك على حرية طيور الارض وارغامك لها على صنع مظلة تقي امرائك من قيظ الصيف وحرارة الشمس !

وكمن صب على راسه وعاء ماء بارد لاح الملك وهو يحملق في الهدهد الذي استطرد :

- ان امرائك انسان ككل الناس .. وليس لك الحق ، وليس لها الحق في استعباد الآخرين .. ولكي تمارس عبوديتك امامها فانك تستعبد الآخرين .. مولاي ان امثالك وان تنفسوا الهواء على ظهر البسيطة ، لكنهم في عداد الاموات شاؤا أم ابوا .. اما الحي فهو الحر وحده ، الحر الذي يحاسب ضميره ، ويحترم ارادة الاخرين وحرياتهم . لذا فان كل من يستعبد الاخرين ، وكل من يرتضي بالعبودية لنفسه ، يعتبر ميتاً وليس بحي ، لهذا فاني إعد الاموات من على ظهر كوكبنا اكثر عدداً من الاحياء !

ولما سمع الملك ما قاله الهدهد ، ايقن للفور صواب ماقاله وما ذهب اليه ، فتراجع عن قراره وتصميمه ، ونزع تاجه من على راسه ووضعه على راس الهدهد . ومنذ ذلك اليوم ، وهذا التاج يعلو راس الهدهد كما تقول الحكاية . ومما قاله الراوي ايضاً على لسان الملك :

- إن الاحرار وحدهم جديرون بالتيجان واكاليل الغار !

